حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پڕۆگرام و چاپەمەنییەکان

# سەرەتاکانی فەلسەفە

## بۆ پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی

د.حسام الالوسی | د.احسان محمد الحسن
د.علی حسین الجابری | د.قیس النوری
ا.د.عبدالامیر الاعسم | د.خالد الجابری
الست فاتنه حمدی جمیل | جمیل ابراهیم الحبیب

**گۆڕینی بۆ کوردی**
نوری علی أمین فوئاد حسن خۆشناو
عوسمان علی محمود

**پێداچوونەوەی زانستی و زمانەوانی:**
عوبێد خدر فەتحوڵڵا
ئاکۆ صابر عوسمان

چاپی نۆیەم ٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی

**سەرپەرشتی زانستی چاپ:**
عوبێد خدر فەتحوڵڵا

**سەرپەرشتیاری هونەری چاپ:**
عوسمان پیرداود کواز
ئاری موحسین

**نەخشەسازی:**
عوسمان پیرداود کواز

**بەرگ:**
زاگرۆس محمود عرب

# بەشی یەکەم

## (فەلسەفە و واتاکانی)

### چەمکی فەلسەفە:

شتێکی ئاسان نییە، توێژەر بتوانێت پێناسەیەکی کورت و وردو سەرتاپاگیر بۆ فەلسەفە بکات هەروەکو لە پێناسەکردنی هەندێ زانستی دیکەدا بەرچاو دەکەوێ، چونکە واتای فەلسەفە بەرە بەرە لەتەک ئەو گۆڕانکارییە مێژووییەی زانیاری مرۆڤایەتی و خودی فەلسەفەدا گۆڕانی بەسەرداهاتووە.

فەلسەفە وشەیەکی یۆنانییە لە هەردوو وشەی " فیلۆ" و "سۆفیا" پێکهاتووە، وشەی "فیلۆ" بە مانای خۆشەویستی دێت و"سۆفیا"ش بە مانای دانایی(حیکمەت) دێت کە پێکەوە مانای خۆشەویستی بۆ دانایی دەگەیەنێت.

فەلسەفە دەیەوێت بە ئاشکرا سنووری ئەو شتانە دیاری بکات کە بابەتی توێژینەوەکانیەتی، تا ئەو ڕادەیەی دەتوانرێت فەلسەفە بەوە پێناسە بکرێت کە (زانستی زانیاریەکانە) یان، بۆ نموونە: ئەگەر مامۆستای زانستەکان، نە بایەخ بە ناساندنی زانستەکەی بدات و، نە بە دیاریکردنی واتای زۆر لەو وشانەی بەکاریان دێنێت وەک:(مادده)،(جوڵە)، (هۆکار)، (یاسا) ... هتد، مانای ئەوە نییە کە پشتگوێی خستوون، بەڵکو لەوەیە کە ئەم ئەرکە بۆ فەیلەسوفان جێ دێڵێت. جا لەبەر ئەوەی بیرو چەمکەکانی فەیلەسووف کە بابەتی توێژینەوەیین، بەزۆری هەست پێکراو وبەرجەستە نین، بەڵکو بریتین لە بیرو چەمک و لێکدانەوەی داماڵدراو، بۆ نموونە: (فەیلەسووف لەبری ئەوەی باسی مرۆڤێک بکات باسی چەمکە گشتییەکانی هەموو مرۆڤەکان دەکات کە "مرۆڤایەتییە"، هەروەها لە بری ئەوەی باسی ڕەنگی تەباشیر یان باسی دیواری گەچکراو بکات، بە گشتی باسی "سپێتی" دەکات. جا لەبەر ئەوەی باسەکە بەم جۆرە کەوتۆتەوە،

ئەوا هەر لەسەرەتاوە نابێت چاوەڕوانی ئاشکرایی و ڕوونی بکەین لە فەیلەسوف لەپێناسەکردن وتوێژینەوەی فەلسەفەدا، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە لەبەرئەوەی فەیلەسوف لەم کارەیدا پشت بەو بیر و بۆ چونانەی دەبەستێت، بۆیە دەبێ ئەوەی لێ چاوەڕوان بکەین کە جیاوازی و ناکۆکی لە پێناسەو لێکۆڵینەوەکانیدا هەبێت. لەبەر ئەمە راستیان وتووە کە: تاکە فەلسەفەیەک نییە، بەڵکو فەلسەفەی زۆر و ئاراستەی جۆراوجۆر هەیە لەوانەیە هێندەی ژمارەی فەیلەسووفەکان فەلسەفەی جیاواز هەبێت، بۆیە لەم بارەدا گرانە پێناسەیەکی سەرتاپاگیری بۆ بکرێ. لەبەر ئەوە دەڵێن **"فەلسەفە هەوڵدانێکی چاکی مرۆڤانەیە بۆ گەڕان و توێژینەوە و ئەزموونەکان، نەوەک زاراوەیەک بێت بۆ پێناسەکردن".**

ئەمە لەتەک پێناسە کۆن و نوێیەکاندا دژوارو ناتەبا نییە، وەک ئەوەی وا پێناسە کراوە کە فەلسەفە گەڕانە بەدوای ڕاستییەکاندا، یان خۆشەویستیە بۆ دانایی ولەم بابەتانە .. هەروەک لەمەودوا ڕوون دەبێتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانرێت بوترێت کە یەک فەلسەفە نییە، بەڵکو فەلسەفەکاری هەیە.

**" فەلسەفەکاری": (چالاکیەکی ژیریی هۆشیارانەیە، کە فەیلەسووفان هەوڵدەدەن بەهۆیەوە لە سروشتی بیرو سروشتی واقیع و ئەزموونی مرۆڤایەتی تێ بگەن)،**

**پوختەی پێناسەکانی فەلسەفە: (ئێمە هەندێ پێناسەی فەلسەفە پێشکەش دەکەین بۆ تێگەیشتنی فەلسەفە بە ئاسانی. فەلسەفە چالاکییەکی بەرنامەڕێژە بۆ زانینی ڕاستییەکان لە رووخسارە جیاوازەکەیدا، لەنێویشیاندا گەردوون و مرۆڤ و پەیوەندییەکانی نێوانیان، فەلسەفە هەوڵدەدات لە واتای گەردوون و ژیان بگات، و شیکردنەوە لەسەر پەیوەندی مرۆڤ بە گەردوونەوە بکات، لەلایەکەوە لەڕووی توانای مرۆڤ لە زانین و هەڵسەنگاندنی بۆ گەردوون، ولەلایەکی دیکەشەوە ئەرک ومافەکانی مرۆڤ بەرامبەر بە خۆی و ئەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژی و بەرامبەر کەسانی دیکەش).**

## جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان فەلسەفەکاری ئاسایی و ڕێکخراو پوخت:

زانیمان کە فەلسەفەکاری چالاکییەکی گشتی مرۆڤانەییە، بەڵام چەند ئاستێکی هەیە، لەوانە ئاستی فەلسەفەکاری ئاسایی، یان ناتایبەتمەند یان سادە، یان نارێک، ئەمەش ئەو ئاستەیە کە لای زۆرینەی خەڵک(ڕەمەکی خەڵک) دەردەکەوێت، هەروەها لە ڕێگەی (پەند) و قسەی نەستەقی باو و، لە داستانە دێرینەکاندا و لە هۆنراوە و هونەر بە گشتی دەردەکەوێت. بەڵام ئاستی (فەلسەفەکاری) ڕێکخراو و پوخت ئەوە لە فەلسەفە ناسراوەکان دەیانبینین و ناوی ئەو فەیلەسوفانەی بە درێژایی مێژوو ناسراون. ئەمانەش گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان هەردوو ئاستی فەلسەفەکارین:

### أ- کێشەی زمان:

لە کاتێکدا مرۆڤێکی ئاسایی بە زمانێکی سادە فەلسەفەیەکی ئاسایی دەردەبڕێت، کە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەیەتی، بەڵام فەیلەسوفەکان لە ڕێی زاراوەی هونەری وردو پوختەوە بیروڕایان دادەڕێژنەوە، کە دەبێت فێریان ببین، وەک چۆن فێری زاراوە تایبەتمەندەکانی هەر زانستێک دەبین، لە هەمان کاتیشدا ئەو زاراوە هونەریانە دەبنە گەورەترین کۆسپ و بەربەستی تێنەگەیشتن لە نێوان زۆربەی فەیلەسووفان و خەڵکی ئاساییدا، بەڵام ئەو کۆسپانە هەرزوو کەمدەبنەوە دوای فێربوونی زاراوە و خوێندنەوەی بەردەوام، زاراوە لە هەموو زانستێکدا گرنگە، وازلێهێنان و دەست لێبەردانی ئەستەمە، چونکە هێندە وردی و چڕی تێدایە، هەر زاراوەیەک جێی ڕستەیەکی تەواوی ئاخاوتنی ئاسایی دەگرێتەوە.

### ب- هزر (بیرۆکە):

ئەو بیرو هزرانەی کە لە فەلسەفەی ئاساییدا هەن لێڵ وشاراوەو نادیارن، بەڵام لە هزر و بیری فەلسەفەی ڕێکخراو و پوخت دا ئاشکراو ڕوونن. فەلسەفە لە بیرکردنەوەی ئاساییدا، لە قۆناغی کۆرپەلە یان لەشێوەی سەرەتایی دایە، کەچی لە فەلسەفەی پوخت دا بوونەوەرێکی تەواو پێگەیشتووە.

### پ- کێشەی ڕێکخستن و گونجان:

ئەو بیرورایانەی لە ئاستی سادە، یان ئاساییدان، ڕێکخستن وگونجانیان تێدا نییە، کەچی لە ئاستی ڕێکخراو و پوخت دا بە شێوەیەکی گشتی ڕێکخستن وگونجان و پێوەلکانێکی بەهێز دەبینین، ڕێبازی فەلسەفە لەم جۆرەدا بونیادێکی پتەوی هەیە.

### ج- پچڕان و بەردەوامێتی:

فەلسەفەکایی ئاسایی پچڕپچڕە، بەڵام فەلسەفەکاری ڕێکخراو و پوخت حاڵەتێکی بەردەوام و هەمیشەییە لای فەیلەسوف. فەلسەفەکاری هەروەک ئەوە وایە کە چۆن هیچ کەسێک بە شووشەچی، ناو نابەین، تەنیا ئەوانە نەبێت کە بەردەوام خەریکی شووشە تێگرتن و دروستکردنی شوشەن، هەرواش مامەڵە لەگەڵ (فەلسەفەکاری) دا دەکەین، ئەگەر بە وردی وشەی فەیلەسوف بەکاربێنین، ئەوا هەرگیز بەو کەسە ناڵێین (فەیلەسوف) کە جاروبار دەڕوانێتە شتەکان و لێیان ڕادەمێنێت، یان گومانیان لێدەکات، بەڵکو بەو کەسە دەڵێین فەیلەسوف کە هەمیشە و بەردەوام خەریکی ئەم کارەیەو وای لێکردووە ببێتە گرنگترین مەبەستی ژیانی، ولێکۆڵینەوە لە بارەی سروشتی شتەکان دەکات و هۆکارێک بێت بۆ بیرو بۆچوونەکانی و زیادکردنی ئەو زانیاریانەی کەسانی دیکە لەوەوپێش پێی گەیشتوون و ئەوەی لە بارەی ئەو مەسەلانەی دەگوترێ و بیرمەندانی دیکە بیری لێ دەکەنەوە.

### چ- ڕوونی هوشیاری و لێڵیەکەی( نادیاری):

سەربارى ئەوەی لە پێشەوە ڕوونکرایەوە، دەبینین مرۆڤ لە قۆناغەکانی یەکەمی ژیانیداو، لە ژیانی ئاسایی خۆیدا، گەلێ شێوەی هوشیاری جیاجیای تێدا هەبووە، لە هونەرو زانست و ئەفسانە و بیروباوەڕ و شتی دیکەدا، بەر لەوەی هوشیاری ڕێکوپوختی تێدا دەربکەوێ، لەو سەردەمەدا زانستێکی سەربەخۆو تایبەت بە کۆمەڵ، یان سروشت، یان مرۆڤ نەبووە، هەروەها هەست و پێزانینی کۆمەڵایەتی تەنیا کەسێک لەتەک کۆمەڵ، یان خێڵ هاوجووت بوون واتە یەک بوون،

لەبەر ئەوە هەست و هزریان و ڕەوشتیان و جوانی و جوانکاریشیان چوون یەک بوون، بەڵام لەقۆناغی بیرکردنەوەی ڕێک وپوخت دا، کە بەدوای قۆناغی یەکەمدا هاتووە ئەم هەست و پێزانینە لە ڕووی ناوەرۆک و ڕووخسارەوە گۆڕدراوە، چونکە دەزگاو ڕێکخراوەکان هاتونەتە گۆڕێ وەک دەوڵەت و پۆلیس وسوپا، کردارەکانیش دابەش بوون بۆ هزری و جەستەیی، هەست و پێزانینی ڕێکخراو و پوخت سەرهەڵدەدات و زانستەکان لەیەک جیادەبنەوە، شتەکان بەلای مرۆڤی ئاساییەوە بەو شێوەیە بوو کە دەیبینی، بۆنمونە هیچ گومانی لەوەدانەبوو کەزەوی ناجوڵێ واتە تێڕوانینی بەشێوەیەکی ئەوتۆیە کەهیچ شیکردنەوەو ڕەخنەیەکی بۆی نیە ئەمەش تێڕوانینێکی واقیعیانەی سادەیە، هەروەها بۆچونەکانیشی پشت بە هەست ونەستی دەبەستێ وتێبینیەکانیشی پەرت وبڵاون، هیچ جۆرە چەمک ودەستەواژەیەکی گشتی لەبیردۆزو یاسا بە یەکیان نابەستێتەوە، بۆنمونە ئاسن و مس و زێر دەناسێ و بەکاریان دێنێ، بەڵام هیچ جۆرە چەمکێکی گشتی بەکرداری لە بارەی کانزاو لە بارەی ئەم یاسایانەوە لانیە کە حوکم بەو کانزایانەوە دەکەن.

## پێداویستییەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە

لەو هەموو ئەو شتانەی گوتراو لێمان کۆڵیەوە دەتوانین بە کورتی هۆکارو پێداویستی فەلسەفەکاری لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

### ١- ڕامان و سەرسامبوون و واق وڕمان:

گرنگترین سیفەتی مرۆڤ لە پاڵ گردبوونەوە و بەکۆمەڵ بوونیدا، لەوەدایە کە مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە، سەبارەت بە بوونی خۆی و شتەکانی دەوروبەری پرسیار بکات، مرۆڤ کە بۆ یەکەمجار هۆش و هەست دەکات بە جۆرێک بوونی خۆی دەسەلمێنێت کە پێویستی بە لێکدانەوە نەبێت، بەڵام ئەم حاڵەتە زۆر ناخایەنێت، چونکە دوایی پرسیار دەکات، (ئەو پرسیارکردنە بریتییە لە فەلسەفە)، پرسیارکردن مرۆڤ تووشی سەرسامبوون و واق وڕمان دەکات، ئیتر چەند ئاستی

بیرکردنەوەی نزم بێت، پرسیارەکانی لەمەڕ نهێنی ئەو شتانەی کە هەن کەمتر دەبێت، بەڵام چەندە هۆشیاری مرۆڤ ڕوون و فرەبێت، کێشەکەی بەلاوە گەورەتر دەبێت و، ئەو کاتە ڕامان و سەرسامییەکەی دەبێتە واق وڕمان و دوای ئەوە بڕیاری ئەوە دەدات کە شت بزانێ.

### ٢- گومان و تاقیکردنەوەی زانیاری:

لە ڕاستیدا گومانکردن تایبەتمەندییەکی ژیریتی مرۆڤە، گومان کاتێک سەرهەڵدەدات کە زانیارییە هەستییەکانی مرۆڤ وا دەکەونەوە کە خەڵەتێنەرن (وەک: تێنوو تەراویلکە (سراب) ی ئاو دەبینێ، تادار هەست بە تامی ئاو ناکات لە کاتی داگرتنی لەرزوتادا، بەچاو دیتنی قەبارەی خۆر وەک فتبۆڵێک، نەبینینیی ڕەنگ لە لایان کوێرانەوە. بەخواری، یان بە شکاوەیی دیتنی قەڵەمێک (پێنووسێک) لە نێو ئاودا.... هتد)، لەمەوە گومان لای مرۆڤ دروست دەبێت، چونکە وا هەست دەکات کە ژیری و هۆشی مرۆڤ لە دژواریدایە، (هەروەک ئەم هەموو ڕاو بۆچوون و بڕیارو باوەڕە جیاجیانەی لە ئارادایە، تا ئەو ڕادەیەی فەرمان دانی جیاواز لەسەر تاکە شتێک دەدرێت لە لایەن کەسانێکی زۆرەوە). هەروەها مرۆڤ لای وایە، ئەو زانیارییانەی خەڵکی بەهۆی لاسایکردنەوە پەیدایان کردووە، پشت بە خۆبەدەستەوەدان دەبەستێت کەلەوانەیە هیچ بنچینەیەکی نەبێت، ئینجا گومان لە ناخ و بیریدا دەروژێنێت، بۆیە دەکەوێتە خۆی بۆ گەڕان بەدوای زانیارییە راست و دروستەکان (کە گومان هەڵناگرن).

### ٣- ترس لە کاری نەبینراو (نەدیتراو):

بەشێکی زۆر لەو کێشانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە، کە مرۆڤ دەخاتە دڵەڕاوکێوە، وەک: مەرگ و نەخۆشی و ئێش و ئازارو تێکۆشان لە ژیاندا، ملکەچێتی بۆ ڕێکەوت وهۆکارە نادیارەکان و شتی دیکە، هەموو ئەمانە سەرچاوەیەکن لەسەرچاوە بنچینەکانی فەلسەفەکاری.

### ٤- بەیەکگەیشتن و گفتوگۆی نەوەکان:

بەیەکگەیشتن و پەیوەندی نەپساندن لە تەک کەسانی دیکەدا، گرنگترین هۆکارەو، یەکێک لە فەیلەسوفە نوێیەکان لەو باوەڕەدایە بەهای فەلسەفە

بەستراوە بە پەیوەندیکردنی خەڵکی بە یەکدیەوە،چونکە هەرچی فەلسەفە هەیە هەوڵی ئەوە دەدات بگاتە خەڵکی دی و خۆی بناسێنێت و دەربکەوێت وخەڵکی ببیبسن، چونکە مرۆڤ بە بەیەکگەیشتن و پەیوەندی نەپساندن دەگاتە ئامانجی فەلسەفە، ولە کۆتاییدا هەست بە هەموو ئامانجەکانی دیکەی دەکات لە تێگەیشتن لە بوون (الوجود) و ئارامبوون.

## بوارەکانی فەلسەفەو ئامانجەکانی بە درێژایی چاخە مەزنەکان:

مەبەسـت لـە باسـکردنی ئەم بابەتـە تەنیا بـۆ ئەوەیە، لـە ئامانجە سـەرەکییەکانی مێـژووە درێژەکـەی فەلسـەفە بگەیـن، تاکـو ئـەو وێنەیـەی فەلسـەفە تـەواو بکێشـین، کـە تـا ئێسـتا خەریکی دروسـت کردنـی بوویـن، بە بابـەت و بەرنامـە و ناسـاندن و گیروگرفتەکانیەوە. بۆنمونـە ئامانجـی فەلسـەفەی کـۆن (هینـد و چیـن و میزۆپۆتامیـا و میسـری کـۆن) ئامانجێکـی زانسـتی و ژیانـی بووە کـە دەوری مرۆڤ و ڕەوشـت و چارەنووسـی داوە، ولەبـارەی کێشـەی مـەرگ و نەمری و دەربازبـوون لـە جەسـتە یـان لەئێشـو ئـازار دواوە. کەچـی لـە فەلسـەفەی یۆنانیـدا، لـە (ئەرسـتۆتالیس) ەوە بیگـرە هەتـا دەگاتـە قوتابخانە سروشـتیەکانی پێش (سـۆکرات)، ئامانجی فەلسـەفە و بابەتە سـەرەکییەکانی بریتـی بوون لـە: توێژینەوە لە جیهانە سروشـتییەکەی کـە دەوری مرۆڤـی داوە، ئایـا بنچینەی(ڕەچەڵەکـی) ئـەو شـتانەی کـە هـەن چیـن؟ ئایـا هەموویـان یـەک توخمـن یـان زیاتـرن؟ ئـەی چـۆن لـە یـەک توخمـی و زۆر توخمـی شـتەکان بگەین؟ فەلسـەفە و زانسـت لای ئـەوان هـەر یەک شـت بـووە.. ئەوان هـەم زانـا بوون و هـەم فەیلەسـوف، بـەڵام بایەخـدان بە جیهانـی دەرەوە، گـۆڕاو ڕووی کـردە بایەخـدان بـە مـرۆڤ و ڕەوشـتی مـرۆڤ و پەیوەندییەکانی بە خەڵکـی دیکەوە، ئەمەش لەسـەر دەسـتی سۆفسـتاییەکان و سـۆکرات دا بەئـاکام گەیشـت، وپاشـان لەسـەر دەسـتی ئەفلاتۆن و ئەرسـتۆ و فەیلەسـوفە موسـڵمانەکان و فەیلەسـوفە نوێیـەکان و هاوچەرخەکاندا،

باسەکان سەبارەت بە گەردوون ومرۆڤ و کۆمەڵگە و سیاسەت و هونەر گەیشتە ڕادەی کامڵبوون لەبوارەکانی فەلسەفەی (سروشت) و (میتافیزیقیا) و (زانستی لۆژیک - المنطق) و (فەلسەفەی هونەر) و (زانستی جوانکاری) و (فەلسەفەی ڕەوشت) و (فەلسەفەی زانستەکان) و (بیروڕاکان) . هەرچی فەلسەفەی نوێیە ئەوا ڕووی کردۆتە لێکۆلینەوەی مرۆڤ وەکو کەسایەتی واقیعی نەک بە گشتی، هەروەها فەلسەفەکاریش بەسترایەوە بە کارکردن و گۆڕانکارییەوە، لەبەرئەوە زانست و هۆش (العقل) لە پێناو گۆڕانی جیهان بەکارهێنرا، بە واتایەکی دی بیر بە کارکردنەوە بەسترایەوە. ئەمەش کلیلی بەشی هەرە زۆربەی ئاراستە فەلسەفییە هاوچەرخەکانە، کە پێویستن بۆ بونیادنانی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو.

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

١- گرنگی فەلسەفە ڕوون بکەوە؟

٢- جیاوازی نێوان فەلسەفەی ئاسایی و فەلسەفەی ڕێکخراو و پوخت چییە؟

٣- وشەی (فەلسەفە) لە چی پێکهاتووە و واتای چی دەگەیەنێ؟

٤- ئایا دەتوانین بڵێین: فەلسەفە خۆشەویستی داناییە؟ ئەم دەستەواژەیە چی کەمە؟

٥- هەوڵدە پوختەی بیرۆکەی سەرەکی لە پێناسە جیاجیاکانی فەلسەفە ڕوونبکەیتەوە، پێناسەیەک بکە کە هەموویان پێکەوە کۆبکاتەوە؟

٦- گفتۆگۆ لەسەر پێناسە جیاوازەکانی فەلسەفە بکە؟

٧- پێداویستییەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفی چییە؟

٨- ئامانج لە فەلسەفەی هیند وچین و میزۆپۆتامیا ومیسری کۆن وئامانجی فەلسەفە لەسەردەمی یۆنانییەکان و موسڵمانەکان و لەسەردەمی (نوێ) ڕوونبکەوە؟

٩- نموونە لەسەر هەندێ جێبەجێکردنی کردەیی (کرداری) فەلسەفە بهێنەرەوە.

## بەشی دووەم

### جۆرەکانی بیرکردنەوە

دەتوانین جۆرەکانی بیرکردنەوە، بەم شێوەیە پۆلین بکەین بکەین:

١- بیرکردنەوەی داستانی (ئەفسانەیی کۆن).

٢- بیرکردنەوەی ئایینیانە.

٣- بیرکردنەوەی زانستیانە.

٤- بیرکردنەوەی فەلسەفیانە.

دەست دەکەین بە دیاریکردنی تایبەتمەندییەکانی هەر چوار شێوازی بیرکردنەوە کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

**یەکەم: بیرکردنەوەی داستانی (ئەفسانەیی کۆن):**

پێویستە بە کورتی لە بارەی ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە بدوێین، چونکە ئەمەیان قۆناغێکی مێژوویی زۆر دوورودرێژ دەگرێتەوە لە چاو قۆناغەکانی دیکەی بیرکردنەوەی فەلسەفی و زانستیانە، و هێشتا گەلێک لە ئامراز و تایبەتمەندییەکانی لە کۆمەڵگەکەمان و چەندان کۆمەڵگەی دیکەی جیهاندا بە جۆرێک لە جۆرەکانی هەن و دەبینرێن، ئەم تایبەتمەندیانەش ئەمانەن:

**١- لاوازی ئاستی بیرکردنەوە:**

مرۆڤی سەرەتایی پشتی بە هەستەکانی دەبەست و بیروکردەکانی لەو سنوورە تێنەدەپەڕی، بەڵام خەیاڵی خۆی زۆر بە فراوانی بەکار دەهێنا، مرۆڤ (بە تایبەتی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی یەکەمیدا) گیاندار و بێ گیانی لێک جیا نەکردۆتەوە، هەرچی شتەکانە گشتیان لە ئاستێکی زۆر لە یەکدی نزیکەوە بوون، زۆر لەوە نزیکتربوون کە ئێمە دەیانبینین، لای وابوو جۆرێک پێوەندی شاراوە بە یەکی بەستوونەوتەوە، هەرچی دیاردەو بوونەوەرە سروشتیەکان هەن بەلای مرۆڤی سەرەتاوە وادیاربوون کە تێکەڵن بە شتە نهێنی و غەیبییەکان، هەر کاتێک دیاردەیەکی تایبەتی بەخۆیەوە (لایەنی دەروونی) تووشی بووایە یان ڕووی بدایە،

وەک: خەوبینین، یان تایبەت بەو شتانەی دەوروبەریەوە، وەک: لافاو، باران، پەتا، قات وقڕی، یەکسەر پەنای دەبردە بەر هێزێکی نادیار کە لە پشتەوەیەتی و کاری لێدەکات و لێی دەپاڕایەوە وقوربانی پێشکەش دەکردو نزای دەکرد،تەنانەت کاتێک کە دەیبینی مرۆڤ لەسەرمادا ڕەق دەبێتەوە، وای دادەنا سەرما بریتییە لە لایەنێکی جادووی جادووگەرێک، یان هێزێکی نادیاری تایبەتی وەک گیانی مردووان، یان شەڕانگێزی رووحە بەدکارەکان.

**٢- زیندووێتی مادده (بوونەوەر):**

ئەمە دوو واتا دەبەخشێت، یەکەم: ئەوەیە مامەڵەی مرۆڤی سەرەتایی بۆ شتەکان وەک زیندوو کراوە، واتە شتێک نییە زیندوو بێت و شتێکی دیکە زیندوو نەبێت . دووەم: باوەڕیان وابوو کە هەرچی شتەکان هەیە گشتیان گیانیان تێدایە، ئەمە سەرەتای لێک جیاکردنەوەی نێوان بێ گیان و گیاندار بوو، یاخود مادە وگیان بوو. ئەگەر بەردێک غلۆر بۆوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ گیانێکی تێدایەو غلۆری کردۆتەوە، لێرەدا دەردەکەوێت مرۆڤی سادە چۆن تێڕوانینی بۆ خودی خۆی و ویستەکانی و سەربەستی و جوولەی خۆی بەسەر هەموو شتەکاندا سەپاندووە، تا ئەو ڕادەیەی ئەگەر بەردێک قاچی بریندار بکردایە، سزای دەدا.

بیرکردنەوەی ئەفسانەیی لە بنەڕەتدا لەسەر ئەوە دامەزراوە کە دیاردە سروشتییە نازیندووەکان بە ڕەنگی ژیان بۆیە بکا، هەروەکو چۆن بوونەوەرە زیندووەکان هەست دەکەن و هەڵدەچن یاخود وەکو مرۆڤ سۆزو کینەیان هەیە.

**دووەم: بیرکردنەوەی ئاینیانە:**

ئەوەی لێرەدا مەبەستە، ڕوونکردنەوەی ڕووی ڕاستی بیرکردنەوەی ئاینیانە لە تەک گرنگترین تایبەتمەندیەکانێتی کەلە شێوازەکانی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی و فەلسەفیانەو زانستیانەی جیادەکاتەوە. هەروەها ئەوە باس لەوە ناکات کە پێی دەگوترێ (لاهوت) یان فەلسەفەی ئایینی، گەر بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لە فەلسەفەی ئایین بێت،

یان فەلسەفەی لاهوتیتی بۆ ئاینێکی تایبەت وەکو ئایینی ئیسلام یاخود کریستیان (مەسیحی) یاخود هەر ئاینێکی دیاریکراوی دیکە بێت.
بەر لە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی ئایینی، پێویستە زۆر بەکورتی، پەنجە بۆ جووتە لێکدانەوەییکی گەورەی سەرهەڵدانی ئایینداریتی ڕابکێشین، **یەکەم: لێکدانەوەی مێژوویی هۆشمەندانەی پوخت (مرۆڤیانە)، دووەمیان: لێکدانەوەی ئاینییانە یاخود (یەزدانییانە).**

### ١- لێکدانەوەی هۆشمەندانەیی پوخت (مرۆڤیانە):

ئەم لێکدانەوەیە بەڵگە و بڕوانامەکانی لە لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکانەوە وەردەگرێت، کە دەربارەی باوەڕو ئاینی ئەو گەلانەن هێشتا لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی سەرەتاییدان. هەروەها ئەم لێکدانەوەیە پشت بە هەندێک لە شوێنەوار و بە هێڵە گشتییەکان دەبەستێت (بە واز هێنان لە بیردۆزە جۆراوجۆرەکان).
مرۆڤی سەرەتایی دوای ئەوەی شتەکان و ئەو ژیانەی جیاکردەوە کە تێیدایەتی هەروەک لە باسکردنی شتە زیندووەکان روونمان کردەوە، کە شمەکەکانی دایە پاڵ گیان و هێزە غەیبیەکان (نادیارەکان) بەمە ترسێکی دی خستەسەر مەترسییەکانی دیکەی لە سروشت، ئەویش مەترسییە لە بوونەوەرە نەبینراوەکان، ئیتر هەرچی بەسەر دەهات و هەرچی لەسەر شانۆی سروشت و ژیان ڕووی دەدا گشتیانی دەدایە پاڵ ئەو هێزانە، هیچ پەنا و داڵدەیەکی بۆ نەمابۆوە جگە لەوەی بە جادووبازی و فاڵ و نزاو قوربانی قایلیان بکات... ئەمانە گشتیان دیاردە بەرابیەکانی ئایین بوون.
لەبەر ئەوەی مرۆڤی سەرەتایی لەنێو جەنگەڵەکاندا ژیانیان لەسەر ڕاووشکاربوو، ترسی ئاژەڵە دڕەندەکان ناچاری کرد ئاژەڵ و ڕووەک بپەرستێ، لەمەوە ئایینی تەوتەمێتی سەری هەڵدا، تەوتەمی کردە هێمایەکی خێڵەکەی و خۆی لەبیرۆکە پیرۆزەکەی دەبینیەوە و بەمەش هێزە لە ڕادەبەدەرەکانی پێ یەکلادەکردەوە: کە بیرۆکەی (خواوەند) یان (هێزە مەزنەکە) ی دەنواند، پاشان لەم تەوتەمێتیەوە چەمکی جۆراوجۆری حەرامکردن و قەدەغەکراوە پیرۆزەکان هاتنە ئاراوە کە بە (تابووTaboo)

ناسران ئەمەش ڕووکەشی کۆمەڵایەتییانەی هەموو ئایینێکە.کاتێک مرۆڤ لە ڕاووشکارەوە بەرەو کشتوکاڵ چوو، یەکەمین تەگەرە کەهاتە سەر ڕێی، پەیداکردنی دانەوێڵە بوو، یان بەروبوومێکی کشتوکاڵی پوخت بوو، ئیتر لێرەوە کێشەی بە پیت و فەڕ بووە خولیای و پەنای بردە بەر جادووکاریی و قوربانی پێشکەشی زەوی کرد تا قایلی بکات وپێشکەشی ئەستێرەو هەسارەکانی کرد بۆ ڕاکێشانی بەزەیی و سۆزیان، چونکە وای دانابوون کە ئەوانە بوونەوەری گیانین و مەڵبەندی برووسکە و بارانن، سەرچاوەی باو و ڕووناکین، هەر هەسارەیەک بووە خوایەکی تایبەتی و بەمجۆرە (هەسارەپەرستی) سەری هەڵدا، هەر هەسارەیەک خوایەکی پسپۆڕ و تایبەتمەندی دیاردەیەک بوو، ئەمەیان خوای باران بوو، ئەوەیان خوای پیت وفەڕ بوو...هتد.

سەرچاوەی ترس ولەرزی مرۆڤی سەرەتایی هەر ئاژەڵ و نەهامەتییە سروشتییەکان نەبوو، بەڵکو ئەوەش بوو کە هەمیشە لە تەکیدا بوو، خەونەکانیشی بوو بە تایبەتی ئەو خەونانەی بە مردووەکانییەوە دەیبینی لە مەشیانەوە ڕێزگرتن و پیرۆزی (مردوو پەرستی) سەری هەڵدا لە میسرو ڕۆما و مەکسیک و پیرۆ دا پادشا وەک خوا دەپەرسترا هەتا لە دوای مردنیش.

### ٢- ئایین لە خوداوەیە لە ڕێی سرووشەوە (وەحیەوە) (لێکدانەوەی ئایینی):

ئایینی (حەنیفیە) ئەو ئایینە یەکتاپەرستیە بوو کە ئیبراهیم خەلیل (خودا لێی ڕازی بێت) بانگەوازی بۆکرد و بەسەرچاوەی ئایینە ئاسمانیەکان دادەنرێت دوای ئەویش (ئایینی یەهودی ومەسیحی وئیسلام) دێن، سەرەتا مرۆڤ ڕێنمایی و ئامۆژگاری لە ئایینی یەکتاپەرستی وەرگرت، قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئایینە سەرەتاییەکان دەکات وەک پەرستنی هەسارەو پەیکەرەکان وبە خوازانینی پاشایان وپەرستنی گیانەکان و سروشت،هەروەها باسی هاوبەشی پەیداکردن بۆ خودا(واتە فرە خودایی)، و باسی ڕێژەی سیفەتی جەستەیی ومەعنەوی خوداوەندەکان دەکات،وە قورئانی پیرۆز باسی باوەڕی حەزرەتی ئیبراهیم و پەیڕەوکەرانی دەکات

که پاک وڕاست و لێبوردەیە، بەڵام بەلاڕێ براوە (واتە شێوێندراوە)، ناوەرۆکی ئەوەش ئەوەیە کە ئایینی ئاسمانی دان بەهیچ ئاینێکدا نانێت تەنیا یەکبوونی ڕاستەقینە نەبێت وئایین بە سروشی(وەحی) خواهانە دەنێردرێت، بنەماو تۆکمەکانی ئایینی ڕاستەقینە بریتیە لە بڕواهێنان وسەلماندنی بوونی تاکە خواوەندێک کە گەردوون و مرۆڤی هێناوەتە ئاراوە،ئنجا ڕێنمایی و ژیری وهۆشی بە مرۆڤ بەخشیوە تا بە هۆیانەوە خودا بدۆزێتەوە کە چۆن گەردوونی ڕێکخستوەو بیر لەبوونەوەرەکانی خوداوەند بکاتەوە، هەروەها لە مرۆڤ خۆی، ئنجا بڕواهێنان بە زیندووبونەوەی دوای مەرگ و ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەی کردارەکانی خەڵکی و ئەوسا چاکەکاران بۆ بەهەشت و بەدکارەکانیش بۆ دۆزەخ (وەک لە ئایینی ئیسلام ومەسیحی و یەهودی دا هاتووە).

## سێیەم: بیرکردنەوەی زانستیانە

پێویستە شتێ دەبارەی ئەو پەرەسەندنانەی بەسەر واتای زانستدا هاتووە بزانین، هەروەها چۆن واتای زانست بەرەبەرە بە تێپەربوونی سەدەکان هاتۆتە کایەوە و پێکهاتووە، و چۆن بەرنامەکان و شێوازی کارکردنی زانست پێکهات، هەتا گەیشتۆتە ئەوپەڕی وردەکاری و وریایی لە بەکارهێنانی هۆش (عەقل) ی مرۆڤایەتیدا، لە میانەی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

### ١- زانست لە کۆندا:

شۆڕشی دۆزینەوەی شوێنەوارەکان لەسەردەمی نوێ دا ئەو هەڵەیەی ڕەتکردەوە کە دەڵێ یۆنانییەکان پێش گەلان کەوتوون لە هێنانە گۆڕێی زانستدا، ئەم ڕاستیە شارستانێتی میزۆپۆتامیا و میسری کۆن دەیسەلمێنن سەبارەت بە داهێنان ودۆزینەوەکانی تایبەت بە ئامێرەکان وکەرەستە بەکارهاتووەکان لەبواری ڕاووشکار یان چێشت لێنان یان کشتوکاڵ یان خانووبەرە یان تەون و چنین و ڕستن و شتی دی لەم بابەتانە... تەنیا چاوخشاندنێک بەو شتانەدا کە مرۆڤ لە سەدان هەزار ساڵی لەمەوبەر لەم بوارانەدا بە دەستی هێناون بەڵگە و نیشانەی

قەرزبارییەکی مەزنی مرۆڤایەتییە بەرامبەر مرۆڤی یەکەم و سەرەتایی، کە ئەو هەموو شتەی داهێناوە تەنانەت توانیویەتی جۆگە لێبدات و شار دابمەزرێنێت و زەوی ئاوەدان بکاتەوە و کانزاکاری بکات و ئامرازی کانزایی و تەختەیی و کەرەسەی جەنگی دروست بکات و پێویستیەکانی پۆشین و خۆپاراستن لە نەهامەتییەکانی ئاوو هەوا و سروشت مسۆگەر بکات هەر خۆشی خاوەنی دۆزینەوەکانی هێزە سروشتیەکانە وەک ئاگر و با و ئاو... هەروەها ئەو داهێنانەی بە گەشەسەندنێک دادەنرێت لە بواری پێگەیاندنی بیری مرۆڤدا بە جۆرێک لە قۆناغەکانی دواتردا بۆ سەرهەڵدانی زانست بە واتا ڕاستەقینەکەی.

ئەو زانیاریە کەڵەکەبووانە وردەوردە وایان لە مرۆڤ کرد کە بتوانێت سەرەتا بەرایییەکانی بیرکردنەوەی زانستیانە بێنێتە ئاراوە ئیتر لە کورتە باسێکی ئاوەهادا دەرفەتی لەمە زیاتر نییە درێژە بەم تێبینیانە بدەین سەبارەت بەزانست لە شارستانێتیە مێژووییەکان(نوسراوەکان). شارستانێتیە مێژووییەکان(نوسراوەکان)ئەو شارستانێتیە مەزنانە بوون کە هەزاران ساڵ لەمەوبەر لە کەناری ڕووبارە گەورەکاندا هاتنە ئاراوە، نیل و میزۆپۆتامیا و هیندستان و چین ئەمانە بە پێی سەردەمەکەیان گەشەیان سەندووە و پشتیان بە زانست بەستبوو هەروەک چۆن پشتیان بە هۆش ودانایی مرۆڤ بەستبوو.

## ٢- زانستی یۆنانی:

ئەو بیرۆکەیە باوی نەما کە دەڵێ: هەرچی زانست و فەلسەفەی مرۆڤایەتی هەیە یۆنانییە و لە یۆنان سەری هەڵداوە و گەلانی میزۆپۆتامیا و دۆڵی نیل هیچیان نەبووە جگە لە ئەفسانە و دواکەوتن،چونکە ئەو شوێنەوار و بەڵگە زانستیانەی کەلەم دوو شارستانێیەتە وشارستانێتی دیکەی خۆرهەڵاتدا دۆزراونەتەوە، ئەو بیرو بۆچونانە پوچەڵ دەکاتەوە ودەیسەلمێنێ ئەوەی یۆنان لە مەیدانەکانی زانستدا پێشکەشیان کردووە درێژەپێدەری شارستانیەتەکانی پێش خۆیەتی، ولەکەڵەکەبوونی ئەو زانستانەوە هاتونەتەدی کەبەر لەو هەبوون. سەبارەت بەم ڕاستیە

بیرۆکەی باڵا دەستی یۆنانی لە زانستدا هیچ ڕەگێکی نەبووە و لە تروسکاییەک دەچێ لە تاریکییەکدا بدرەوشێتەوە، ئینجا ئەوانەی ئەم تێڕوانینە هەڵەیە بڵاودەکەنەوە، دەبێت باش بزانن کە ئەو زانست و فەلسەفەیەی لە ئاسیای بچووک و باشووری ئیتاڵیادا سەری هەڵدا ئەوا لەمیسریەکان وگەلانی میزۆپۆتامیا وفینیقیەکان وەرگیراوە، زانایان و فەیلەسوفەکانی یۆنان وەک تالیس و ئەفلاتون و هیرودوت گەواهین و دان بەوەدا دەنێن کە زانستەکانی بیرکاری و گەردووننناسی و شتی دی لە نێو خۆرهەڵاتییەکاندا لە پێش ئەماندا هەبووە ئەمان: لە میللەتەکانی خۆرهەڵاتەوە فێری بوون و وەریان گرتووە.

لەمەش گرنگتر ئەوەیە، کە مێژووناسەکانی زانست، وەک (سارتون)و چەندانی دیکە بەشێکیان لە زانستی میسریە کۆنەکان وگەلانی میزۆپۆتامیا، زۆر، یان کەم وەرگرتووە، و زۆر بە دووروودرێژی سەبارەت بە پێشکەوتنی هونەری ئاوەدانکردنەوە دواون و دانیان بەوەدا ناوە کە دروستکردنی ئەهرامەکان و بەنداوەکان و تۆڕەکانی ئاوداشتن، بەبێ زانستی ڕووبەر و ئەندازە و ئاوداشتن و بیناسازی و بەرد و کانزا، نەهاتونەتەدی، هەروەها پێشکەوتنی زانستی کیمیا و دەرمانگرتنەوە بۆ مۆمیا و هونەر، وێڕای پێشکەوتن لە گەردووننناسیدا بە جۆرێ کە هەندێ لە مێژوونووسەکانی بیرکاری دەڵێن: بابلیەکان بە بنەڕەتەکانی جەبرو ئەندازە و دۆزینەوەی ڕێی نزیک بۆ ڕەگی دووجا زانیویانە چۆن هاوکێشەی پلەی دوو شیکار دەکەن، هەروەها میسرییەکان حسابی قەوارەی هەڕەمی ناتەواوی چوار بنکەییەکان زانیوە، دەستووری حسابکردنی ڕووبەری سێگۆشە و لاکێشە و بازنەنیان بەکارهێناوە. گەلای بەڕەدی و تاتە قوڕینەکان دەری دەخەن چۆن و تا چ ڕادەیەک لە نۆشداری نەشتەرگەری (کرداری وبیردۆزی) پێشکەوتوو بوون... دەستوور و یاساکان لە میزۆپۆتامیادا دۆزراونەتەوە، وەک میلەکەی حامورابی، کە پیشانی دەدات چۆن وڵاتی بابل لە یاسا و دەستوری کۆمەڵایەتیدا پێشکەوتووبووە، دەبێت شارستانی یۆنانی چی خستبێتە سەر زانستی مرۆڤایەتی؟

## ١- زانستی یۆنانی کۆن

ئاشکرایە کە یۆنانییەکان لایەنی بیردۆزییانەی زانستیان گەلێک بەرەو پێشەوە برد، بەڵام لەڕووی دەسکەوتی کردارییەوە، وەک: ئاوەدانکردنەوەی شار و، بەربەستی ئاوو، ئاودێری و هاتوچۆو کشتوکاڵ و کانزاسازی و... هتد... شتێکی ئەوتۆیان لەوانە زێتر نەبوو کە لە شارستانێتیە خۆرهەڵاتییەکانی بەر لە خۆیان بەجێ مابوون. ئەمەیش گەواهیدانی مێژوونووسی زانستی گەورە (برنال)ە.

بەڵام لەلایەنی زانستی بیردۆزیەوە، بەشداریەکی مەزنیان هەیە وخۆی لەم خاڵانە دەبینێتەوە:

١- دۆزینەوەی گرنگترین تایبەتمەندێتی زانست کە (سەراپاگیری و گشتێتییە)، وەک ئەرستۆ دەڵێت: ئەوەی گشتێتی تێدا نەبێت زانست نییە، بە واتای دۆزینەوەی (یاسای زانستی) یان لە شتە تاک و بچووک و بەشبەشەکانەوە بۆ بڕیاردانی سەراپاگیری، ئەمە بنچینەی پێشکەوتنی زانست و فەلسەفەیە لای یۆنانییەکان، کە واتای (پەتێتی) دەگەیەنێت.


فەلسەفە لای یۆنانییەکان

٢- ئەم ئارەزووویان بۆ زانینی گشتێتی و یاسا پەتییەکانی شتەکان مۆرکی بیردۆزیانەی بە زانستەکەیان بەخشی، ئەمەیش ئەو تایبەتمەندیە گەورەیە کە مێژوونووسانی بیری خۆرئاوایی بە سنووری جیاکەرەوەی نێوان بیری یۆنانی و گشت بیرکردنەوەیەکی بەر لەوانی دادەنێن.

بەڵام لەگەڵ گشت ئەم لایەنە چاکانەدا کەچی لایەنی خەوش وکەموکورتی کەوتە نێو زانست و فەلسەفەی یۆنانییەوە... ئەمانە گرنگترینیانن:

أ- زێدەڕۆیی کردن لە (سەراپاگیرێتی) تا دەگاتە ڕاددەی بڕیاردانی بەپەلە بەسەر شتەکان و پشتگوێخستنی تێڕوانینی تاکەکەسی بۆ دیاردەکان.

ب- لە ئەنجامی ئەمەشدا سنووری جیاکەرەوەی نێوان زانست و فەلسەفەیان لا نەمابوو، بەڵکو تەنیا یەک جۆر زانیاریان لە لا هەبوو، کەبووە مایەی درەنگ دەرکەوتنی زانست، تا لەسەردەمی نوێدا زانستەکان سەربەخۆ بوون و بەرەوپێشەوە چوون.

ج- بەچاوی سووک ڕوانینە زانستە کردارییەکان(العلوم التطبيقية) یاخود ئەوانەی سوودی کرداریی دەبەخشن، لەم بوارەدا پێشکەوتنێکی ئەتۆیان بەدەست نەهێنا کە شایانی باسکردن بێت، ئەو زانستە کردارییانەی گۆڕانکاری لە ژیاندا دەکەن هەر لە بەنداو و کشتوکاڵ تا کانزاکاریی و... هتد چونکە باوەڕیان وابوو کارو پیشەکان تەنیا بەشی کۆیلەکان بوون شایستەی پیاوە ئازاد و خاوەن کۆیلەکان نەبوون،سەرەڕای ئەوەش زۆربەی فەیلەسوفەکان بە سووکی دەیان ڕوانییە زانیارییە هەستییەکان.

## ٢- زانست لە سەدەکانی ناوەڕاستی خۆرئاوا (ئەوروپا):

زانست لەهیچ بوارێکدا پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا شایانی باس بێت، هیچ گۆڕانکارییەکی نوێ لە چەمکی زانستدا نەهاتە ئاراوە هەروەک ئەرستۆ ئاماژەی پێداوە وکڵێسەش پاڵپشتی کردوە،

هەموو دەرچوون و لادانێک لێیان دەرچوون و لادان بوو لە پیرۆزیی ئایینی(مەسیحی)، ئەمەیان لە ڕووی بەرنامە و ئاسۆکانی زانستەوە.

سەرەرای ئەمەش شێوازی بیرکردنەوە، ئەو گفتوگۆیە نەزۆکانە بوو کە لە (کتێب) ەکانەوە وەرگیرابوون، نەک ڕاستەوخۆ لە سروشتناسییەوە.

### ٣- زانست لە سەردەمی ئیسلامدا:

تایبەتمەندی سەرەکی لێرەدا پێشکەوتنی زانستەکان بوو، زانستی ئیسلامی لاسایی کەرەوەی یۆنان نەبووە، بەڵکو ڕەخنەگرتن بووە لە هەڵەکانیان، بۆیە ناوی زانایانی یۆنانی دووبارە بۆتەوەو باسیان لێوە کراوە، چونکە زانستی ئیسلامی لەرێگەیەکی دیکەوە دەڕوات کە بریتییە لە:-

أ. گرنگیدان بە زانستی ئەزموونی، و بەکارهێنانی توێژینەوەی زانستی، و ڕوونکردنەوەی بنەمای بەرنامەی ئەزموونگەری لەسەر دەستی زانایانی موسڵمان، کە لەوانەوە ئەوروپای نوێ زۆر شتی وەرگرت، ئەم مەرجە تێبینی کردنی وردی دیاردەکان و دانانی گریمانەی شیکاری و ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بۆ دڵنیابوون لەخۆوە دەگرت.

ب. بەکارهێنانی زانست لەپێناو دۆزینەوەی نهێنییەکانی سروشت و زاڵبوون بەسەر جیهانی سروشت، لەراستیدا بەرهەمی جێبەجێکردنی زانست بوون، زانا موسلمانەکان لێهاتووبوون لە بەکارهێنانی ژمارە و دانانی بنەماکانی زانستی ژمێریاری کە دەتوانرێ لەژیانی ڕۆژانە بەکاربهێنرێ. هەروەها بیرکاری(جەبر) و ئەندازەی شیکاری و سێگۆشەزانیان داهێنا، ئەمانەش هەموو ڕێگە خۆشکەری سەردەمێکی نوێ بوو لەبەکارهێنانی بیرکاری بۆ گوزارشتکردن لە یاساکانی جیهانی سروشتی، جێبەجێکردنی بنەماکانی لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕووبەری زەوی و حیسابی کاتەکان دروستکردنی ئامێری ئەلکترۆنی، هەروەها دۆزینەوەی فەلەکی(گەردوونی) ڕێنیشاندەری دەریاوان و جوگرافی ناسان بوو. بەڵام توێژینەوە دەرمانسازی و

پزیشکیەکان خاوەنی بەڵگەی جێ بەجێکردنی ئاشکرا و روون بوون، یەکێک لە گرنگترین ئەو هۆکارانە سەرباری فراوانبوونی جیهانی ئیسلام و هاتنە ناوەوەی شارەزایی و ئەزموونی میللەتانی دیکە، هۆکارێکی دیکەی سەرەکی بریتیە لە تێروانینی ئیسلام لەوەی کە دونیاو ئاخیرەت، زانست و ئایین بەیەکتر دەبەستێتەوە، وجەخت لەسەر دروشمی(کار بۆ دونیا بکە وا بزانە تاهەتایە دەژی، کار بۆ دوارۆژت بکە کە بەیانی دەمریت).

## ٤- زانست لە سەردەمی نوێدا:

لەوبەندەی تایبەت بەمێژووی فەلسەفە ئەو هۆکارانە دەخەینە بەرچاو کە بوونە مایەی گۆڕانی بیرکردنەوە سەبارەت بەزانست و فەلسەفە... هەروەها لەو بەندەی تایبەت بە بەرنامە، هێڵەکانی بەرنامەی زانستی نوێ ئاگادار دەبین، و لە بەندەکانی دیکەدا بەکورتی لە میژووی فەلسەفە دەکۆڵینەوە و لە فەیلەسوفانی سەردەمی نوێ دەدوێین کە تایبەتمەندێتیەکانی تێڕوانینی زانستی نوێیان دروستکردووەە چ بە ڕێبازی ئەزموونکاری بێت، یان بیرکاری و ئەنجام بەدەستەوەدان و ژیرێتی بێت.

ئەوەی کە ئێستاکە پێویستە لەسەرمان لێی بدوێین: تایبەتمەندێتیە سەرەکییەکانی تێڕوانین و بەرنامەی زانستیانەو سروشتی زانستی ئەمرۆیە، کەئەمانەن:

یەکەم – ناتوانین ئەو پێشکەوتنە زانستیەی کە لەئەوروپادا ڕوویدا، لە دەستکەوتە زانستییەکانی زانا موسڵمانەکان جیابکەینەوە و لێکیان دابپڕین.

دووەم – جیابوونەوەی زانستەکان بەرەبەرە لە فەلسەفە، بە تەنیا لەسەردەستی زاناکان نەهاتۆتەدی(پێک نەهێنراوە)، بەڵکو فەیلەسووفەکانیش ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە .

سێیەم – پشتبەستن بەتێبینیکردنی دیاردەکان وتاقیکردنەوەیان بەکردار، لەبری ئەوەی تەنیا بە (ئاخاوتن – لێدوان) بێت، واتا تێگەیشتنی

سروشت و چارەسەری کێشەکانی ژیان و لێکدانەوەی دیاردە سروشتییەکان تەنها لەوەدا نەمان لەرێی رامانی بیردۆزیەوە، یان بەهۆی نیشانەو هێما بێژییەوە بن، بەڵکو زاناکان شتەکان دەدۆزنەوە و فەیلەسوفەکانیش ئەنجامەکان کۆ دەکەنەوە و فەلسەفەکەی لێ پێک دەهێنن.

چـوارەم – زانسـت و یاسـای زانسـت، بەروبوومـی ئەزمـوون وتاقیکردنەوەنـەکان بـوون. ئەرکـی زانـاکان توێژینـەوەی دیـاردە دەسـت نیشـانکراوەکانە و، لەراسـتیەکی بچووکـەوە، چـوون بـۆ یەکێکـی دی، وردەوردە لەسـەر دەسـتی ژمارەیەکـی زۆری زانایانـی بـوارە جیاجیاکانـدا تـەلاری زانیـاری بەرزبـۆوە، وتێروانینێکـی راسـەقینانەتر بـۆ جیهـان و شـتەکان سـەری هـەڵ دا.

پێنجەم – هەموو زانستێک بۆ کاپێکردن و راپەراندن دەشێت. جا ئیتر ئەو زانستە پەیوەندیی بە بابەتەکانی زەوییەوە بێت یان ئاسمان، یاخود پێویستیە سادەکانی ژیان بێت وەک خۆراک و پاراستنی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: زانست و بیر تەنیا بۆ (لێکدانەوە) ی جیهان و شتەکان نین، بەڵکو بۆ گۆرینیشیانن.

شەشەم – هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی بیرکاری و پێوەرە چەندێتییەکان لە زانستدا، واتا دارشتنی یاسا زانستییەکان لە بۆتەیەکی بیرکارییانەدا، واتا لەشێوەی رێژە ژمێرەییەکاندا، بۆ نموونە: با نەڵێین ئەو گەرمە، بەڵکو بڵێین گەرمابیەکەی (٣٥) پلەی سەدییە، لەگەڵ دانانی رێژەی ژمارەیی بۆ پلەی شیانکاری (ئیحتمال) و راستەقینەیی وپیادەکرنی یاساکان بەسەر بارودۆخە توێژینەوەییەکان.

## تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی زانستییانە:

گەرچی توێژەران لە پاش و پێشخستنی ئەم تایبەتمەندیانەدا جیاوازن، بەلام لەوە دەچێت تێکرا لەسەر ئەم خالانە کۆک بن کە ئەمانەن:

## ١- کەڵەکەبوونێتی:

زانست زانیاری کەڵەکەکراوە، زانیارییە زانستییەکان لە باڵەخانە دەچن کە نهۆم لەسەر نهۆم بنیاد نرابێت، تەنیا یەک جیاوازی هەیە، ئەویش ئەوەیە کەدانیشتوانی ئەم باڵەخانە زانستیە بەردەوام بەرەو نهۆمە نوێیەکانی سەرەوە دەگوێزرێنەوەو،ئەوەی لەژێریاندایە جێی دێڵن، لەمەدا بەپێچەوانەی فەلسەفەیە، چونکە فەلسەفەی نوێ، ئەوەی پێش خۆی ناسڕێتەوەو ونی ناکات، لەگەڵ هاتنی هەر فەلسەفەیەکی نوێدا، فەلسەفە کۆنەکە نابێتە (مێژوو) یەکی ڕووت، وەک لە زانستدا ڕوودەدات و بیردۆزە کۆنەکە دەبێتە ڕووداوێکی (مێژوویی) ڕووت، ئەم تایبەتمەندێتی کەڵەکەبوونێتیە، خاڵێکی سەرەکی ڕاستەقینەی زانست دەردەخات کە (ڕێژەییە) بە واتای زانست گەشە دەسێنێت، ئەوەی بە ڕاستییەکی زانستییانە دانراوە پاش ماوەیەک گۆڕانکاری تێدا کراوە، یان بە جارێک لابراوە و شتێکی دی جێی گرتۆتەوە،بۆ نمونە بیردۆزی (بەتلیمۆس) یان فیزیکی نیوتن، لەسەردەمی خۆیاندا ڕەهای تەواو بوون، کەچی تێڕوانینی نوێی گەردوون بە بیردۆزی کۆپەرنیکۆس و هەروەها فیزیای ئاینشتاین جێی ئەوانیان گرتەوە، ئەمە واتای (ڕێژەییە) لەهەمان کاتدا ڕێژەییەکی یەقینە، چونکە ڕاستیەکی بابەتیانەی بێ لایەنە،پابەندی هەست وسۆزمان نییە،وەک چێژی هونەری تابلۆیەک نییە،لەوەدا یەقینە کەلەسەردەمی خۆیدا ڕاست بووە.

گەشەکردنی کەڵەکەبوونێتی بەدوو ئاراستەدا دەڕوات:ئاراستەی ستوونی و ئاراستەی ئاسۆیی – لە ستوونیدا زانست بە دوای هەمان دیاردە دەگەڕێت کە پێشتر لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کردوە، بەڵام بە تێڕوانێکی نوێتر، بۆنمونە بابەتی سروشتی تەن ومادەکان بابەتێکی کۆن و نوێیە، چونکە بەردەوام پەرەدەسێنێ و قوەڵدەبێتەوە. بەڵام ئاسۆیی بریتییە لە ئاراستەی زانست بۆ فراوانبوون و درێژبوونەوەی بۆ بوارو پسپۆری نوێتر، تا ئەو ڕاددەیەی کە زانستەکان لە سروشتی نازیندووش دەکۆڵنەوە، تاگەیشتنە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی بەرنامەییانەی

زانستی، وەک لە بواری کۆمەڵناسی و دەروونناسی بەدی دەکرێت.

### ٢- ڕێکخستن:

زانست ڕێکخەری ڕێبازی بیرکردنەوەمانەو ڕێکخەری شێوازی ژییریمانە، ئەمە واتای زاڵبوونە بەسەر خوو ڕەفتاری جۆراوجۆرمان و،ملکەچکردنی بیرکردنەوەمان بۆ ویستە هۆشمەندییەکانمان.

### ٣- سەراپاگیرێتی و بابەتیانە:

زانیاری زانستییانە سەراپاگیرییە (گشتگیرە)، واتا: گشت نموونەکانی دیاردەکە دەگرێتەوە، هیچ پەیوەندی بەسەر دیاردە تاکەکانەوە نییە، کاتێک زانست لەمەڕ کەوتنە خوارەوەی تەنەکان دەدوێت، ئەو ئاخاوتنەی یان ئەو دۆزینەوەیەی، پێوەندی بە باسکردنی کەوتنە خوارەوەی تاکە تەنێک نییە لەو تەنانەی هاوشێوەی خۆی ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە ڕاستی زانستییانە لەوەدا سەراپاگیرییە کە هەر ژیرییەک شارەزای بوو، بە پەسەندی دادەنێت و بڕوای پێدەکات، بەبێ گوێدانە حەز و ئارەزووی توێژەرەکە.

### ٤- وردەکاری و بیرکردنەوەی وەسفیی(چەندێیتی):

زمانی زانست لە زمانی ئاسایی ناچێت، لەزمانی زانستدا وردەکاری هەیە، لە زمانی ئاساییدا دەبیستین دەڵێن: دڵم وام پێدەڵێت، یان وای بۆ دەچم... ئەمانە وتەی تەواون و مەبەست دەردەبڕن، بەڵام زانست بەم زمان و ئاخاوتنە ڕازی نابێت، بەڵکودەیەوێت زمانی بیرکاری بەکاربهێنێت، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا.

## چوارەم: بیرکردنەوەی فەلسەفیانە:

لەمەوبەر، سەبارەت بە فەلسەفە و ئاستەکانی و سەرچاوەکانی پێناسەکانی و بابەتە سەرەکیەکانی و پرسیارە گرنگەکانی و جیاوازییەکانی

نێوان فەلسەفە و نێوان بیرکردنەوەی ئەفسانەییانە و ئایینیانە و زانستییانە دواین لەبەر ئەمە ئێمە لێرەدا زۆر لەسەری ناڕۆین و، بە شێوەیەکی تایبەتی خەریکی کۆکردنەوەی تایبەتمەندەیە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەبین.

## تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە:

### ١- فەلسەفە واتە بیرکردنەوە:

فەلسەفە بیرکردنەوەیە لە گەردوون، لە مرۆڤ، لە زانیاری وڕێگاکانی زانیاری، ڕوونتر بڵێین: ئێمە کاتێک لەمەڕ ئەفسانە وئایین و زانستی سروشتی دەدواین هەڵوێستی جادووگەر و پیاوی ئایینی و زانایانمان نەگرتەبەر، بەڵکو فەلسەفەکاریمان دەکرد، یان شیکردنەوەکانمان لە ڕێی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە دەخستە بەرچاو، تەنانەت کاتێک خەریکی شیکردنەوەی پێناسە شیاوەکانی فەلسەفە بووین نەخشەی تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی سەرچاوە و ئامانجەکانیمان دەکێشا ئەو کاتەش هەر فەلسەفەکاریمان دەکرد.

### ٢- فەلسەفە پرسیارکردنە:

واتای پرسیاری گەورەتر، ئەوە نییە پرسیارێکی گەورە پێشکەش دەکات، بەڵکو واتای پرسیارێکی هەمیشەییە، تەنانەت وتوویانە: پرسیارەکان لە فەلسەفەدا لە وەڵامدانەوەکان گرنگترە، چونکە فەلسەفە وەڵامی یەکجارەکی و کۆتایی پێهێنەر ناداتەوە، چونکە وەڵامی کۆتایی، کۆتایی هاتنی فەلسەفە خۆیەتی، تەنانەت کۆتایی هاتنی هەموو بیرکردنەوەیەکە، فەلسەفە هەمیشە شتەکان لە شێوەی پرسیاردا دادەڕێژێت، گشت وەڵامێکیش، هەر فەیلەسوفێک لەمەڕ هەر کێشەیەک بیداتەوە، نرخ و بەهاکەی لەوەدایە کە دەشێت فەیلەسوفێکی دی لە نێوان گفتوگۆو هەڵسەنگاندنی خەوشەکانیدا، بتوانێت پرسیارەکە بە شێوەیەکی گونجاوتر

دابڕێژێتەوە. لەبەرئەوە فەلسەفە بڕوای بەوە هەیە کە هۆشمەندان مافی دەربڕینی ڕایان هەبێت.

گرنگترین تایبەتمەندی فەلسەفەکاری و پرسیاری فەلسەفییانە ئەوەیە لە سنووری بینین، یان ئەزموون، کە زانایەک پێی هەڵدەستێت ناوەستێت و، شتەکان، وەک پارچەی پەرش وبڵاو نابینێت، وەک دەنکە پەرشبووەکانی تەزبێحێکی پەت پچڕاو بۆیان ناڕوانێت، بەڵکو هەوڵ دەدات ئەم پارچە و بەشانە و، ئەم دیاردە بە دوویەکدا هاتووانە گشتیان پێکەوە ببەستێتەوە، تا دەگاتە ئەو چەمکە سەراپاگیرییانەی هەموو بەش و پارچەکان بە خۆیانەوە گرێ دەدەن و گشتیشیان پێکەوە لێکدەدەنەوە، ئا بەم جۆرە فەلسەفە لەمەڕ دیاردە مادەییەکان دەگاتە چەمکی (سروشت)و، سەبارەت بە بوونەوەرە ژیرەکانیش دەگاتە چەمکی (مرۆڤایەتی)، سەبارەت بەدیاردەکانی گەردوونیش دەگاتە چەمکەکانی پێکەوە بەستنی هۆکاریتی سیستەم و ئامانج و گەشەسەندن.

ئەم ئەرکە پێویستی بەکاری زیاتر هەیە لەبواری زانست و زانیاری وشارەزایی دا، ئەمەیان پسپۆڕێتی فەیلەسووفە کە لە هەموو ڕووداوو دیاردەیەکدا، چ لە بواری سروشتدا بێت، یاخود لەبواری ڕەوشت وبەهاکاندا بێت، ئەوپەڕی بنەماو ڕەگەز و سەرچاوەکانی دەپشکنێت و هەڵیان دەسەنگێنێت.

### ٣- فەلسەفە ڕەخنەو شیکردنەوەیە:

لە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە، ئەوەیە کە بیرکردنەوەی ڕەخنەییانەی ئەو زانیاری و بیروڕاو بیردۆزو بۆچوونانەیە کە باون، جا چ بە ڕاشکاوی و ئاشکرایی بێت، یاخود بە ناواخنی و نائاشکرا، لەمەشدا مەبەستی ئەوەیە ڕاستی و دروستییان، یاخود ساختەیی و نادروستییان بخاتە ڕوو. ئەو بنچینە زانیارییانەی کە ئەو زانراوانەیان لەسەر بنیادنراون، نموونەی ئاشکرای ئەمە لە مێژوودا هەیە،

وەک (غەزالی) کە دەستی دایە ڕەخنەگرتنی بنەما زانیارییەکان، وەک ئەندامەکانی هەستکردن و زانیارییە هەست پێکراوەکان، وبڕوا و بەڵگە نەویستە ئایینییەکان و، ژیری و زانیارییە ژیرییەکان . هەروەها (دیکارت) یش کاتێک بڕیارەی دا. گشت ئەو بیروڕایانەی بڕوای پێیان هەبوو، لەخۆی دایان بماڵێت دوای گەڕان و پشکنین و ماندوبوون، هەردووکیان گەڕانەوە بۆ زانیاری بێگومانێتی (یەقین). فەلسەفە هەر بە ڕەخنەلێگرتنی باوەڕ و زانیاری و بیردۆزەکانەوە ناوەستێت، بەڵکو ئەرکێکی دی دەگرێتە ئەستۆی کە ڕەخنەو شیکردنەوەی ئامرازەکانی زانیاری خۆیەتی، وەک هەستەکان وژیریی هەروەها سەبارەت بە(دەرفەتی سەرهەڵدانی زانیاری) و ئەو (ڕێگایانەی دەگەن بە زانیاری) و (دیاریکردنی مەرجەکانی زانیاری) و .... هتد. دەدوێت کە هەموویان دەکەونە چوارچێوەی ئەوەی پێی دەگوترێت(بیردۆزی زانیاری – ئەپیستمۆلۆژیا) . هەروەها ئەرکی ڕەخنەیی شیکردنەوەی فەلسەفی، واتای (تۆژینەوەی بەرنامەکان) دەبەخشێت کە زانستە جۆراو جۆرەکان بەکاریان دەهێنن، وەک بیرکاری و سروشتناسی، لە پێناوی دۆزینەوەی ئەو بنەمایانەی کەئەو بەرنامانەی لەسەر دادەمەزرێ بە شێوەیەکی سەربەخۆو یەکگرتوو.

### ٤- فەلسەفە، پێکهێنان و دروستکردنی باوەڕەکانە و، ڕامانە:

ئەم تایبەتمەندییە خاسیەتی تایبەتی و بەردەوامی فەلسەفە بووە لە بونیەوە تا ئێستا، کەبریتیە لە دروستکردنی ڕێباز و هەڵوێستە بیرییە سەراپاگیرییەکان، لێرەدا بایەخی تایبەتی بەو دەرئەنجامە چاوەڕوانکراوە دەدرێت کە لە پێکەوەبەستنی گشت ئەو زانیاریانەوە بەدەست دەهێنرێت کە مرۆڤ کۆی کردۆنەتەوە، هەروەها لە هەموو ئەزموونە گشتییەکانی مرۆڤیشەوە نەک لە بایەخدان بە بەرنامەو کەرەسە بەکارهێنراوەکان.

لەم چالاکی (پێکهێنان و پێکەوە بەستنی زانیارییەکان) دا فەیلەسوف بەدوای سەراپاگیرترین ڕاو بۆچوونی شیاودا دەگەڕێت لە مەڕ گەردوون و مرۆڤ و سروشتی واقیعەکەو واتای ژیان و بنەمای هۆش و پایەی

مرۆڤ و چارەنووسی و ... هتد.مەبەست لێرەدا سەراپاگیرێتییە، واتا گەیشتن بە تێڕوانینێکی کۆی گشتگیری، لێرەدا فەیلەسوف لە بری پسپۆڕێتی زانا لەو مەڵبەند و دەزگایانە دەچێت کە پێشوازی هەموو ئەنجامێکی زانستە جۆراو جۆرەکان و شارەزاییە بە کۆمەڵەکانی خەڵک دەکەن، فەیلەسوف وەکو (فرانسیس بەیکۆن دەڵێت، لە (هەنگ) )دەچێت کە شیلەی گوڵان دەمژێت، تاکو هەنگوینمان بۆ دروست بکات، یان لە (مایسترۆ) ی سەرکردەی ئۆرکێسترا دەچێت.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

١- تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی بژمێرە و بەدرێژی لە یەکێکیان بدوێ.
٢- لێکدانەوە جۆراوجۆرەکانی سەرهەڵدانی ئایین ڕوون بکەوە.
٣- تایبەتمەندییکانی بیرکردنەوەی ئایینیانە چین؟
٤- سروشتی (زانست) لە جیهانی خۆرهەڵاتی کۆندا (پێش یۆنان) ڕوون بکەوە.
٥- لایەنە لەباشی و نالەبارەکانی زانستی یۆنانی کۆن کامانەن؟
٦- تایبەتمەندییەکانی زانست لە سەردەمە نوێیەکاندا کامانەن؟
٧- تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی زانستیانە ڕوون بکەوە.
٨- تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە ڕوون بکەوە.

# بەشی سێیەم

## بابەتە گشتییەکانی فەلسەفە

لە پێشدا وتمان لە کۆندا فەلسەفە هەردوو مانای زانست و زانیاری دەگەیاند، فەیلەسوف دانایەو حەزی لە دانایی بوونەو بە هەموو زانیاریەکانی سەردەمی خۆی ئاگاداربووە، بەڵام گەشەسەندنی زانستە جۆربەجۆرەکان و جیابوونەوەی پسپۆڕیەتی لە زانستدا بوو بەهۆی سەربەخۆیی ئەم زانستانەو سەرهەڵدانی زانستی نوێ کە بەرەبەرە لە فەلسەفە دوورکەوتنەوە کە لە پێشدا بە دایکی زانستەکان دادەنرا.

فەلسەفە بە سێ بابەتی سەرەکی و چەند لقێک مایەوە جگە لەوەی پەیوەندیشی لەگەڵ زانستە سەربەخۆکانی دیکە لە جێی خۆی مایەوەو ئەم جۆرە پەیوەندییە بە فەلسەفەی زانست ناونرا.

**بابەتە گشتییەکانی فەلسەفە بریتین لە: بوون(الوجود) یان ئەودیو سروشت (هەروەها فەلسەفەی سروشتیش دەگرێتەوە)، وبیردۆزی زانیاری و بابەتی بەهاکان کە ڕەوشتناسی و لۆژیک و جوانناسی دەگرێتەوە، دوای ئەوە فەلسەفەی زانستەکانی دیکە دێن کە گرنگترینیان (فەلسەفەی یاساو فەلسەفەی ئایین و فەلسەفەی مێژوو و فەلسەفەی ڕامیاری و دەروون ناسی و کۆمەڵناسی و تێکرایی مێژووی فەلسەفەو پەروەردەناسی و زماننناسی)ن.**

لە خوارەوە کورتەیەکی ئەو بابەتانەو هەندێ لق و پاشکۆیەکانی فەلسەفە دەخەینەڕوو:

### یەکەم: بابەتی بوون(ئەنتولۆژیا)کە ئەودیوسروشت (میتافیزیک) وفەلسەفەی سروشت دەگرێتەوە:

لێکۆڵینەوەی بوون (الوجود) مانای ڕوانینە لە سروشتی بوون (الوجود)،زانستە سروشتییەکان لە بوون دەکۆڵنەوە وەک تەنێکی گۆڕاو. سروشتناسی لە تایبەتەکانی تەن دەکۆڵێتەوە بێ تەماشاکردنی توخمەکانی. کەچی کیمیا لە پێکهاتەکانی دەکۆڵێتەوەو بۆ توخمەکانی

دەیانباتەوە. زانستە بیرکارییەکان لەبوون دەکۆڵنەوە لە ڕووی ئەوەی کە هەندە یان بڕە – چ ژمارە بن(زانستی بیرکاری) یان شێوە بن( زانستی ئەندازیاری). زانستە دەروونییەکان لە دیاردە دەروونییەکان دەکۆڵنەوە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە پێکهاتنی کۆمەڵگە و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەکۆڵنەوە. لە نێو ئەم زانستانەدا زانستێک نییە لە بوون بکۆڵێتەوە، بوون چییە، واتا بوون بە گشتی و نەکرێتە بەشێکی بوون. ئەم زانستە لای پێشینان پێی دەوترا: ئەودیوسروشت(میتافیزیک). لێکۆڵینەوەی (بوون) تۆژینەوەی تایبەتی گشتییەکانی بوون دەگرێتەوە.

بەدانانی بیردۆزێک دەربارەی سروشتی جیهان و، ئاوا سەیر بکرێت ئایا ڕووداوە گەردوونییەکان و دیاردە سروشتییەکان لەسەر یاسایەکی چەسپاو دامەزراوە یان ڕێکەوت و ڕێکەوتنن. ئایا ئەو ڕووداوانە لە خۆیانەوە سەرهەڵدەدەن یان بە هۆکاری پێویست و بە پێی یاساکانی مادە وجوڵە بزووتنەوە دەڕۆن؟ ئەم لێکۆڵینەوەیە دەربارەی تایبەتیەکانی تەنی سروشتی و، بوونی سروشتی لە کۆندا تا کاتی نیوتن (فەلسەفەی سروشت) ی پێ وتراوە. (زانستی سروشت) یان فەلسەفەی سروشت لای پێشینان بەبیرکاری و ئەودیو سروشت بەشێک بووە لە فەلسەفەی بیردۆزی، ئێستا کە لێکۆڵینەوەکانی زانستە سروشتییەکان سەربەخۆن بوون و، لێکۆڵینەوە گشتییەکان لەبارەی بوون لەچوارچیوەی ئەودیو سروشت (میتافیزیک) ماوەتەوە.

## (میتافیزیک) "ئەودیو سروشت"

لقێکە لە لقەکانی فەلسەفە، بایەخ بە لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە گەردوون بوونەوەر و مرۆڤ دەدات، تا دەگاتە ڕادەی تێگەیشتن و شیکردنەوەیان. جائەگەر لۆژیک (منطق) بە ئامێری زانیاری ڕاستیەکان دابنرێت وبیردۆزی زانیاریش لە ڕێگەو ڕێبازی زانستی بکۆڵێتەوە ئەوا میتافیزیک خودی ئەو ڕاستییانە دەخاتە بەرلێکۆڵینەوە، لەگەردوون و جیهان بەگشتی بە بونەوەران و مرۆڤیشەوە .

**أ. مەبەستی میتافیزیک:** جیهان و گەردوونی دەوروبەرمان تەنانەت مرۆڤ و بونەوەرانیش، ئەم هەموو شتانە هەمەچەشنی و هەمەجۆری بێ سنوور دەنوێنن.

مرۆڤ کاتێ کە دەڕوانێتە شتەکانی دەوروبەری ڕووبەڕووی هەمەجۆری و جیاوازی ئەوتۆی نێوان بوونەوەرەکان دەبێتەوە کە بەسەختی دەتوانێ پەیوەندی نێوان ئەوانە و لێکدانەوەکانی خۆی بەیەکدیەوە ببەستێتەوە. ئەرک ومەبەستی میتافیزیکیش کەمکردنەوە و ساکارکردنی هەمەجۆرییە و بەدیهێنانی جۆرە یەکبوونێکە کە هەموو بوونەوەرەکان لە ژمارەیەکی کەمی بیروباوەڕو چەمک و بۆچوونەکانی بیر و هۆش کۆبکاتەوە.

**ب. جیاوازی نێوان خوێندنگە میتافیزیکیەکان:** خوێندنگەکانی میتافیزیک جیاوازن لە بارەی:

١- تێڕوانینی ناوەرۆکی گەردوون یان ڕاستییە بنچینەییەکانی گەردوون:

یەکایەتی- ناوەرۆکی ڕاستی یەک شتە، بێجگە لە ئەو، ئەوانی دیکە دیاردە و وەسفی ئەم ناوەرۆکەن.

جووتەکی- دەڵێت دوو ناوەرۆک بۆ ڕاستی هەن، یان دوو ڕاستی بنچینەیی هەن هیچیان بۆ ئەوی دیکە ناگەڕێتەوە.

هەمەجۆری- ئەمە وای دەبینێ کە هەمەجۆری ناوەرۆکی شتەکان بە کۆی ناوەرۆکەکان پێکدێن و بە بزربوونیان بزردەبن.

٢- تێڕوانینی نەگۆڕ و گۆڕاو:

فەیلەسوفانی نەگۆڕ: ئەم میتافیزیکیانە ڕاستییان لانەگۆڕە،ودەڵێن گۆڕان خەیاڵ وبەهەڵەداچوونە، یان دیاردەیەکی بێ بایەخ و بێ بەهایە.

فەیلەسوفانی گۆڕاو:ئەمەیان راستی یاخود ناخی گەردوونە، ئەو نەگۆڕانەی کە لە دەوروبەرمان دەیبینین، پەردەیەکی ڕاستی هەمیشەیی نییە.

٣- هەڵبژاردنی ناوەرۆکەی بنچینەیی گەردوون:

نموونەیی: تێڕوانینێکی میتافیزیکیایە، گیان و بیرو بەها نموونەییەکان وەکو (چاکە) بە بنچینەو ناوەرۆکی گەردوون دادەنێت، جگە لەمانەش ئەوانی دیکە دیاردەیەکی مامناوەندی هزر و گیانن.

ماددەیی: ئەمەیان ماددە، بە بناغە و ناوەرۆکی گەردوون دادەنێت و دەڵێت شت بە گەڕاندنەوەیان بۆ ماددە و یاساکانیان شی دەکرێنەوە.

١- تێڕوانینێک بۆ پەیوەندی نێوان خودێتی و بابەتییەتی (الذاتية و الموضوعية):

پەیدابوونی زانیاری وەک لقێکی گرنگی فەلسەفە لە کۆتایی سەدەی (١٧) و کۆتایی سەدەی (١٨) سەرنجی لە تێڕوانین بۆ ڕاستی و گەردوون و جیهان لە بارەی بابەتیەتی یان ئەو شتانەی لە دەرەوەی خودی ئێمەدا هەن بۆ خودناسین و درک پێکردنمان گۆڕی، تا وای لێهات هەندێ لە فەیلەسوفەکان لە سۆنگەی خودناسین و درک پێکردنمان بۆ بابەت و جیهان دەیانڕوانیە بابەت و جیهان .فەلسەفەی واقیعی ئەم تێڕوانینەی ڕەتکردەوە بەوەی کە جیهان لەبوونی دا سەربەخۆیە و دوورە لە درک پێکردنی ئێمە پێیەوە، وتمان لێکۆڵینەوەی(بوون) لێکۆڵینەوەی بوونە بە شێوەیەکی ڕەهایانە ئەمەش پاکانەی پێویستی ئەم لێکۆڵینەوەیە، چونکە هەر زانستێک لێکۆڵینەوەی لایەنێکی یان بەشێکی بوونە (هەروەک نموونەمان بە بیرکاری و کیمیا و.... هتد هێنایەوە). لەبەر ئەمە دەبێت زانستێک هەبێت لە (بوون) بەتەواوەتی بکۆڵێتەوە، بەڵام ئەو فەیلەسوفەی لە بوون دەکۆڵێتەوە، دارستانێک وەک دارستان دەبینێت نەک وەک درەختی تەنیا. بیانویەکی دیکە بۆ ئەم لێکۆڵینەوە ئەوەیە کە هەر زانستێک پەسەند و سەرەتا بەکاردەهێنێت بێ دەرخستنی ڕاستی یان بەڵگە، بۆ نموونە زانستی ئەندازیاری بە پەسەندی بەڵگەنەویستەکی دەست پێدەکات وەک ئەوەی دەڵێ: دووهێڵی تەریب ناگەنە یەک، زۆری دیکە لە بەڵگەنەویستە ناسراوەکانی (ئۆکلیدس) کە هەموویان پشت بە گریمانی (شوێن) دەبەستن، بێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە کە شوێن وڕاستییەکەی و جیهان لەزانستە سروشتییەکان چین ؟ وادادەنێن (ماددە) هەیە و یاسایان

بۆ دادەنێن، یاساکانی (هۆکارەکان) و (بێ پێچەوانەیی) بە گریمان وەر دەگرن، بەڵام ئەرکی ئەوان نییە لە ڕاستی ماددە یان (دروستی هۆکارەکان) و (پێچەوانە) بکۆڵێنەوە، ئەوەی لەمە دەکۆڵێتەوە(میتافیزیک) ە یان (زانستی بوون) ەو، هەروەها دەربارەی چەمکی کات(الزمان)هەمان شت دەوترێت.

**دووەم:بیردۆزی زانیاری (ئیپیستیمۆلۆجی):**

ئەم لێکۆڵینەوەیە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە دەداتەوە:

أ. زانیناری چییە؟ پرسیارێکە دەربارەی خودی زانیاری خۆی؟

ب. لە چی زانیاری وەردەگرم؟ئەمە پرسیارێکە دەربارەی بنچینەی زانیاری وسەرچاوەکەی.

ت. ئایا دەکرێت زانیاری وەرگیرێت؟ ئەمەش پرسیارێکە دەربارەی دروستی زانیاری و سنوورەکەی.

بابەتی زانیاری لەلایەن فەلسەفەی نوێ دروست نەبووە، فەیلەسووفانی هەموو فەلسەفەکانی پێشوو ئەو جۆرە پرسیارانەیان کردووە، بەڵام لە نێو بابەتی (بوون) یان بابەتی سروشت و جیهانی دەرەکیدا لێیان کۆڵیوەتەوە. هەرچی لە فەلسەفەی نوێ دا گیروگرفتی زانیاری بووەتە گرنگترین بەشی فەلسەفە و لێوەیەوە تەماشای گیروگرفتی (بوون) دەکرێت. بیردۆزی زانیاری لە گومانکردن و گومان نەکردن و لە ڕاستی دەکۆڵێتەوە، ولەجیاکردنەوەی زانستی بەڵگەنەویستانە و زانستی پەیداکراو، یان لەزانیاری دەست نەکەوتوو و زانیاری دەستکەوتوو لەتاقیکردنەوەکان و مەرجەکانی زانییاری یەقین دەکۆڵێتەوە،لە گەڵ لێکۆڵینەوە لە مەرجەکانی زانیاری جیاکردنەوە لەنێوان ئەو زانیاریانەی خودی خۆمان هەمانە وئەوانەی لەدەرەوەی خودی خۆمان وەرمان گرتووە. سەرچاوەکانی زانیاری چین و چۆن درک پێکردن بەو شتەی کەدرکی پێ دەکرێت بەیەکەوە دەبەسترێنەوە؟ بۆ نموونە چۆن دەزانم ئەمە کورسییە و پشیلە نییە.

دەگەڕێینەوە سەر پرسیارەکەی (أ) زانیاری چییە؟ لێرەدا دوو ڕێباوەڕ (مذهب) ی گەورە دەربارەی ئەم پرسیارە دەبینین: یەکەمیان: دەڵێت ئەوەی بە هەستەکانمان و بە ژیریی (عەقل) دەیزانین، ئەنجامی شتێکی ڕاستەقینەیەو لەدەرەوەدا هەیە لەتێگەیشتنمان جیایە،کەواتە زانیاری بەم پێیە درک پێکردنی شتەکانە بەهۆی هەستەکان وژیریی وەک چۆن لە واقیع دا هەیە. شت هەیە ڕەشە یان سوورە، چونکە سیفەتێکی وەهای هەیە کە ڕەشی کردووە و هەست بە ڕەشیەکەی یان سووریەکەی دەکەین. ئەم سیفەتە مسۆگەر هەیە، جا ئایا کەسیک دەیبینی یان نەی دەبینی. ئەمە (ڕێباوەری واقیع) ی پێ دەوترێت .دووەمیان: (ڕێباوەری دیاردەکان) یان (ڕێباوەری نمونەیی) کەوا دەبینێت (ئەوەی لە دەرەوەیە) و (ئەوەی لەبیردایە) زۆر جیاوازن. بەم پێیە زانیاری درک پێکردنی شتەکان نییە وەک چۆن لە واقیع دا هەن و وێنەیەکی وەک خۆشی نییە، وەک واقیعیەکان دەیلێن، بەڵکو درک پێکردنی شتەکانە وەک بۆمان دەردەکەوێت و، جیهانی دەرو پشتمانیش بەرهەمی ژییریمانە.

دەرباری پرسیارەکەی (ب) کە لە چی زانیاری وەردەگرم، واتا سەرچاوەی زانیاری چییە؟ هەروەها لێرەشدا دوو ڕێباوەر هەن، یەکەم:(تاقیکارییەکان) یان (هەستییەکان): کە وتوویانە تاقیکردنەوە سەرچاوەی زانیارییە یان بەلای کەمی بنچینەکەیەتی، تاقیکردنەوەش دوو جۆرە: یان لە هەستە دیارەکانەوە وەرگیراوە وەک بیستن وبینین، یاخود لە دەروونەوە(ناخەوە) هەڵقوڵاوە. درک پێکردنی شتە دەرەکییەکان وەک بینینی ئەم کورسییە سپیە، (هەستپێکردن)ی پێ دەوترێت. درک پێکردنی شتەکانی دەروون(ناخ) وەک مانای (کورسی سپێتی) ئەوا ( ڕامان) ی پێ دەوترێت. وتویانە ئەگەر تاکە کەسێک هەموو هەستەکانی نەمێنێت هیچ شتێک دەربارەی ئەوەی کە لە دەوروبەری یان لەناوەوەی دا هەیە نازانێت. دووەم: بەرامبەر بە ئەوانیش ڕێباوەڕانی (ژییرییەکان) وتویانە: (زانیاری بە بیروژییری پەیدادەکرێت، ئەوەی بەهۆی هەستەکانەوە بۆ ژییری دەردەکەوێت ئەوا ڕووی دەرەوەی خەڵەتێنەری شتەکانە و هەستەکان

هەڵە دەکەن چونکە بەش بەش و تاک تاکەن، کەچی زانست و فەلسەفە لەسەر گشتێتی و درک پێکردنی پەیوەندییەکان نەبێت دانامەزرێن)، بۆ نموونە (هۆکارەکان) بێ ژییری ناکرێت. لە پاشاندا چۆن لەو شتانە بگەین کە هەستیان پێناکرێت وەک خوای پەروەردگار(جل جلالة). هەندێک لە بەرهەڵستی تاقیکاریەکان و دان نەنان بەکاری هەستەکان و تاقیکردنەوە زۆر وەستان و، وای بۆ چوون شت لە دەرەوە نایەتە دەروونەوەو ناشێت دەروونێک شتێک دابینێت ئەگەر بێتوو لەبنەڕەتدا ئەو شتەی تێدانەبێت .

هەرچی سێیەم پرسیارەکەیە (ج) دەڵێت: ئایا دەکرێت زانیاری وەربگیرێت؟ واتا ئایا زانیاری یەقینە؟ لێرەدا سێ ڕێباوەڕمان هەیە: ڕێباوەڕی (یەقین) کە تاقیکاریەکان و ژیرییەکان نوێنەرایەتی دەکەن و هەردوولا باوەڕیان بەوە هەیە کە توانای زانینی شتانمان هەیە. بەرامبەر بەمە ڕێباوەڕی دووەم و سێیەم هەن. هەرچی ڕێباوەڕی دووەمە ڕێباوەڕی (گومان)ەو خاوەنی دان بە شیانی زانیاری و توانای مرۆڤ بەسەریا نانێن و، هیچ ڕایەک نادەن. هەرچی ڕێباوەڕی سێیەمە ڕێباوەڕی (ڕەخنەگری) یە ئەوانە ووتویانە پێش ئەوەی لە یەقین بوونی زانیاری یان گومان لێکردنی بدوێین، لەسەرمانە کە لە سنووری زانیاری بکۆڵینەوە بۆ نموونە ئایا هەستەکان و پێکهاتەی (ژییری) مان دەتوانن شتەکان بزانن، ئەگەر دەتوانن تا چ ڕادەیەک؟ کە (ئیمانوئیل کانت) پێی هەڵساوە.

### أ-بیردۆزی زانیاری:

لقێکە لە لقەکانی فەلسەفە لە زانیاری مرۆڤ و جۆرەکانی و پلە جیاجیاکانی دەکۆڵێتەوە،و سنوورو تواناداریەکەشی دەستنیشان دەکات.

### ب- پلەکانی زانیاری:

زانیاری پلەدارە،لە گومان و بۆ چوون و هەست دەست پێدەکات بەدرک پێکردنی بیر تێدەپەڕێ تا دەگاتە یەقینی تەواو کە گومان پێی ناگات، وەک ئەو نموونانەی کە لەبیرکاری دەستمان دەکەوێت ١+١=٢،

س=س زانیاریەکی ڕاست و ڕەوانە گومانی لێ ناکرێ، ئەمەش نموونەیەکە زاناو مرۆڤ و فەیلەسووف بەئاواتی ئەوەن بگەن پێی، بەڵام گەیشتن بەو ڕاستی یە هەرگیز ئاسان نییە، بۆیە نموونەیەکە فەیلەسووفان دەیانەوێ بەپێ ی توانا لێیەوە نزیک ببنەوە. درک پێکردن مانای زانین یان تێگەیشتنی بابەتەکانی هەستەکییە وەک درەخت و خانوو وپەرتووک.بەڵام گومان مانای بڕوانەکردن و نەبوونی یەقینە. هەندێ جار گومان قۆناغێکە لە قۆناغەکان بۆ گەیشتن بە یەقین. کەچی بۆچوون دەست نیشانکردنی زانیارییەو سەرەتایەکە بۆ کاری ناسین کەلە دانان بە نەزانین دەست پێدەکات تا دەگاتە زانیاری یەقین.

## جۆرە سەرەکییەکانی زانیاری

زانیاری جۆراوجۆرە تەنها باسی سێ جۆریان دەکەین:

**١- هەستزانی(زانینە هەستییەکان):**

بیستن وبینین وتام وچێژ ودەست لێدان هەمووی هەستی جۆراوجۆرمانن ولە شتەکان وڕووداوەکانی دەوروبەرمان ئاگادارمان دەکەنەوە.زۆر لەفەیلەسوفان ئەو هەستزانیەی کەلەڕێگای تاقیکردنەوەکانەوە پێمان دەگات بەکارێکی سەرەکی دادەنێن وهەندێکی دیکەیان بە سەرچاوەی یەکجاری زانیاری دەژمێرن،ئەوانەی دوایی وای بۆ دەچن کە هەر چەندە زانیارییەکان شێوەی ڕووت یان گشتیان هەبێ ئەوا دەبێ هەر بگەڕێنەوە سەر بنەڕەت وسەرەتاکانی تاقیکاری هەستەکی. کەچی هەندێ لە فەیلەسوفانی دیکە زۆر بەووردی ڕەفتار لەگەڵ هەستەکان دەکەن چونکە هەڵمان دەخەڵەتێنن و جارجار ڕێمان لێدەگۆڕن، بۆ ئەم مەبەستە نمونەیان هەیە وەک شکانەوەی شێوەی دارێک کە دەخرێتە ناو ئاوەوە یان ئەو سەرابەی کە لەسەر ڕێگا بەرچاو دەکەوێت،وزۆری دیکە کە بە (هەڵخەڵەتاندنی بینین وهەست)ناودەبرێن.

**٢- هۆشزانی (زانینە هۆشییەکان):**

هەندێ لە فەیلەسوفان دەڵێن هۆش(ژیری) خاڵی هاوبەشی نێوان

هەمووخەڵکانە،و هۆش(ژیریی) بە زۆر کاری هەمەچەشن هەڵدەستێ کە بەبێ ئەو زانیاری بەدەست ناهێنرێ. دەڵێن هەر هۆشە درک پێکردن ڕێک دەخات و دەیخاتە بەر بەراوورد و بە یەکیان دەبەستێتەوە و بەشێوەیەکی ڕێک یەکیان دەخات. دەرەنجامەکانیش لە پێشەکییە دیاریکراوەکان و لەزانیارییەکان دەردەهێنێت، هەرچی دەرئەنجامی لۆژیک و بیرکاری هەن هەموویان ئەنجامی کاری ژیریی(هۆش)ن. هەر هۆشیشە پەیوەندییەکانی نێوان هزرە جیاجیاکان پوختە دەکات. واش دەبێ هۆش لەمیانی چالاکییەکانیدا پشت بە زانیاری هۆشی دیکە یان زانیارییەکانی تاقیکاری ببەستێت. بۆ نموونە کۆمەڵناس کۆمەڵگەی جیاجیا لە ڕێگەی تاقیکاری وتێبینی و ژیان بەنێویاندا دەخوێنێ و پاشان هەر لەڕێگەی هۆشەوە هاوچەشنی و جیاوازی نێوان کۆمەڵگەکان دەست نیشان دەکات. فەیلەسوفان هەن دەڵێن هۆش هەر خۆی بەتەنهایی دەتوانێ لە ڕاستییەکان بگات. هەندێکی دیکە هەن لەو بڕوایەدان کە تاقیکاری بەتەنهایی بەم مەبەستە هەڵدەستێ.بەڵام ئەوەی ئەمڕۆکە باوە ئەوەیە کەمرۆڤ خاوەن هۆش و هەستە سەرباری توانای دیکە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە،وزانینی ڕاستیەکان بەدەست ناهێندرێت ئەگەر پشت بەو هەموو توانایانەوە نەبەسترێت.

### ٣- سووسەزانی (الحدس):

گەر هەستزانی پشت بە درک پێکردنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ببەستێ لەرێگەی هەستەکانەوە،وهۆشزانی پشت بەگشتاندن و دەرئەنجامی هۆشەکان ببەستێ، ئەوا سووسەزانی پشت بە درک پێکردنی هونەری دەبەستێ، وەک هەست کردنمان بەپارچە مۆسیقایەکی هونەری یان تێرامانمان بۆپەیکەرێکی داتاشراو. بەڵام سووسەی سۆفیگەرانەش هەیە کە هەندێ جار بە (زانیاری چێژلێوەرگرتن) ناو دەبرێت ئەوا بەگوێرەی ئەوەبێت لەڕێگەی هەست و دڵەوە لە شتەکان دەگەین هەروەک سۆفیەکان وادەڵێن.

## ج- ڕادده و سنووری زانیاری:

زۆر لە فەیلەسوفان دان بەوەدا دەنێن کە زانیاری مرۆڤ سنووردارە، فەیلەسوفانی زانیاری دووچاری کێشەی ڕێژەیی زانیاری سەبارەت بەو ڕاستیانەی کە دەیانزانین بوونەتەوە بەوەی کە هەمیشە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بارودۆخەی کە دەوری ڕاستیەکانی داوەو ژێر کاریگەری هەڵوێستی مرۆڤایەتیمان.زۆر جار هەموو ئەو زانیارییانەی کە پێویستمان پێیەتی لە هەگبەماندا نییەو ناتوانین بڕیاری کۆتایی لەسەر شتەکانی خۆمان بدەین، زۆر جاری دیکەش کارتێکردن لە بیرو بۆچوونەکانی خەڵکی دیکە زۆر ئاسانترە ئەگەر هاتو پێداویستی وهۆکارەکانی ئەم کارتێکردنەمان زانی.

## (سێیەم) بابەتی بەهاکان یان فەلسەفەی بەهاکان (ئەکسیۆلۆژی):

مەبەست لە (بەهاکان) هەڵسەنگاندنی شت و خەملاندییتی، چونکە شێوازە بۆ هێنانەدی مەبەست یان لەبەرئەوەی خۆیان مەبەستن،ئەوەی دواییان دەکەوێتە چوارچێوەی فەلسەفەی بەهاکان (ئەکسیۆلۆژی). کە بۆ سێ شتیان بردۆتەوە:(ڕاستی و چاکەو جوانی). ئەم بەهایانە بە بەهای خۆیەتی(خودیەتی) ناوبراون بەرامبەر بە (بەهای دەرەکی)، بۆنمونە جوانی گوڵ بۆ خودی (خۆیەتی)، بەڵام بەهای ئوتۆمبیل بەستراوە بەو خزمەتەی دەیگەیەنێت، بۆیە (دەرەکیە).

بابەتی چاکە بریتییە لە زانستی ڕەوشت یاخود فەلسەفەی ڕەوشت. بابەتی جوانی بریتییە لە زانستی جوانی (جوانناسی) یاخود فەلسەفەی جوانی. بابەتی ڕاستی بریتییە لە زانستی لۆژیک.

### ١- فەلسەفەی ڕەوشت:

(ڕەوشت ناسی) یان فەلسەفەی ڕەوشت زانستێکە ئەو مەرجانە دادەنێت

کە پێویستە لەکردەوەکانی مرۆڤدا هەبن بۆ ئەوەی ببێتە بابەتێکی

ڕەوشتیی، یان ئەو زانستەیە کە نموونەی بەرز دادەنێت بۆئەوەی ڕەفتاری مرۆڤی پێ دیاری بکرێت، کەواتە زانستێکی(پێوانەکی)یە واتە لەوە دەکۆڵێتەوە کە هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەبێت چۆن بێت، فەلسەفەی ڕەوشت بابەتێکە لەبابەتەکانی فەلسەفە کەلە سروشتی ڕەفتاری ڕەوشت وحوکم و مەرجەکانی ڕەوشت دەکۆڵێتەوە،و ڕەوشت گرنگی بەوەدەدات بگاتە پرەنسیپە گشتیەکان و چەمکە بنەڕەتیەکان کە ڕەفتاری مرۆڤی لەسەر دامەزراوە، بەڵام مەبەست لە ڕەفتاری ڕەوشت هەموو ئەو کردەوانەیە کەبە ئەنقەست لەلایەن کەسێکی هۆشیار ئەنجام دەدرێت کەلەدەرەنجامەکانی ئەو کردەوانەی ئاگاداریشە کە ئەنجامیان دەدات .

بابەتەکانی ئەم زانستە ئەمانە دەگرێتەوە:

**أ- بنچینەی هەستی ڕەوشتەکانمان.**

**ب- ئەو پاڵنەرەی وامان لێدەکات کەهەستە ڕەوشتیەکانمان جێبەجێبکەین.**

**ج- مەبەست و ئەنجامە کۆتاییەکان کە بەکارە ڕەوشتییەکانمان دەمانەوێ بیگەینێ.**

**د- ئەو پێوەرانەی بەکاری دەهێنین بۆ پێوانەکردنی کارەکانمان وحوکم لەسەردانی بەباش یان خراپ.**

بەکورتی ڕەوشتناسان کۆک نین لەسەر سروشتی پرەنسیپ و بەهاکانی ڕەوشت چونکە هەندێکیان دەڵێن مرۆڤ دایناون دواتر بەپێی چەند ڕێسایەکی کردارەکی کە لەسەر کەڵک و بەرژەوەندی خۆیەتی دامەزرابوو پەرەی سەند بۆ چەند ڕیسایەکی دیکە کە لە سەر کەڵکی گشتی دامەزرا،تا لەکۆتاییدا بووبە پرەنسیپە ڕەوشتیە چەسپاوەکان(جێگیرەکان) کەنەتوانرێ دەستکاری بکرێت. کەچی هەندێکی دیکە پێیان وایە ڕێژەییە، واتە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکەش جیاوازە. بەڵام زۆربەی فەیلەسوفانی ڕەوشت بۆچوونیان وایە بنەما ڕەوشتیەکان (پێوەرەکییە)و ڕەهاو ڕێژەیی نییە، جیاوازی نێوان گەلان و سەردەمەکان پەیوەندی بە ناوەڕۆکی پرەنسیپ و بەها ڕەوشتیەکانەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەلێکدانەوەی ئەو پرەنسیپ و ڕێسا

ڕەفتاری و دابو نەریتانەوە هەیە.

بەڵام چۆن کردارەکانمان پێوانە دەکرێ ؟ فەیلەسووفەکان بۆ یاسای خودی تاکەکەسی دەیگێڕنەوە (واتە بۆ بوونی یاسایی ڕەوشتی لەسروشتی مرۆڤدا، بریتییە لەویژدان، یاخود دەنگی ناوەوە یاخود دەنگی هۆشمەندی کە پێی دەڵێن(هۆشمەندییەکان)، فەیلەسوفانی سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسی و هەروەها (کانت)یش هەمان شتیان پێ وتوە، هەندێ لەم فەیلەسوفانە دەلێن تەنها هۆش سزای سەرپێچی ئەرکەکان نادات، بەڵکو (هەست) یان هەست بەئازارکردنی زۆری هەمەجۆر سزا بەخشە. دژ بەم یاسا خۆیەتی(خودێتی)یە هەیانە باوەڕی بە یاسای دەرەکی هەیە لە خوای پەروەردگار یان سزای یاسا مەدەنیە دانراوەکانی دنیایی،یان کۆمەڵگە ودەوڵەت،بۆیە مەسەلەکانی ئازادی و دادپەروەری و یاساش هەر بەمانە بەستراونەتەوە.

### ٢- فەلسەفەی یاسا:

هەندێ لەلێکۆڵەران فەلسەفەی یاسایان کردۆتە لقێکی فەلسەفەی ڕەوشت، لەپاشاندا لە لێکۆڵینەوەی ئەو پەیوەندییەی کەیاساو ڕەوشت بەیەکەوە دەبەستێتەوە کردیان بە پاشکۆیەکی لێکۆڵینەوە ڕەوشتییەکان، تا لەکۆتاییدا چووە نێو چوارچێوەی فەلسەفە زانستیەکان. بیرۆکەی دادوەری کە دەوڵەت بریاری لەسەردەدات، جیاوازە لەگەڵ بیرۆکەی ڕەوشتی کە لەناخەوە ویژدان یان ژێری دەیسەپێنێت. کەچی دادوەری یاسایی لەفەلسەفەی یاسادا کۆمەڵێک یاسان کە دەوڵەت بەسەر دانیشتواندا دەیسەپێنێت. (کانت) (یاسایی کردەوە)ی لە ڕەوشت جیاکردۆتەوە، واتە فەلسەفەی یاسای لە فەلسەفەی ڕەوشت جیاکردۆتەوە، چونکە ئێمە لە یاساکاندا بایەخ بەشتەدیارەکان دەدەین، بۆ نموونە پەیڕەوکردنی یاسا بەکردەوە یان بەکارێکی دیار،پەیوەندی بە نیازەوە نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ببێتە هۆی کردەیەکی دیار چونکە دەوڵەت سزای کەس نادات لەسەر ئەوەی چی لەدەروونیدایە(ناخیدایە)،وە ئایا بیرلەئەنجامدانی

تاوان دەکاتەوە یان نیازی چاکەی یان خراپەی هەیە؟. فەلسەفەی یاسا ڕاستەوخۆ بایەخ بە ڕاستییەکانی یاسای بەشەکان نادات، بەڵکو بایەخ بەو پرەنسیپە بنچینەییانە دەدات کە زانایانی یاسا دای دەنێن، لەگەڵ بایەخدان بەو بیردۆزە گشتییانەش کە زانستی یاسای تایبەتی دایدەنێت.

دەکرێت بابەتەکانی فەلسەفەی یاسا بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە:

أ- فەلسەفەی یاسا لە زانیاری و لۆژیک دەکۆڵێتەوە کە زانستی یاسا پەیڕەویان دەکات، بەو چەمکە گشتییانەش کە لە زانستی یاسادانان و هی دیکە بەکاردەهێنرێن و ناکرێت لەزانستی بەشەکاندا دیاری بکرێت وەک چەمکی (کردەوە) و (نیاز) و (ویست) و (مەبەست) و (هۆ) وخودی واتای (یاسا) و(ئازادی و هەڵبژاردن)، هەروەها لێکۆڵینەوەی لۆژیکی ئەو بەرنامەیەی کە فەقیهەکان یان یاسادانەران پەیڕەوی دەکەن، لە ئەرکی فەلسەفەی یاسایە.

ب- لێکۆڵینەوەی ئەو چەمکە سەرەکییانەی زانستی یاسا بەکاریان دەهێنێت و جیا لەزانستەکانی دیکە تایبەتە بەخۆی، وەک چەمکی(دادوەری)و (سزا)و (پاشکۆیاتی)و (کەسێتی)و (خاوەندارێتی).

ج- لێکۆڵینەوەی بیردۆزیی یاساگشتیەکان: بۆ نموونە مەبەست لەسزادان چییە؟ هەندێ وتوویانە مەبەستەکە ڕاگرتنە، و هی دیکە وتوویانە چاککردنەوەیە، کەسانی دیکە وتوویانە مەبەستەکە سزایە.

دادوەری چییە؟ لێرەدا دوو بیردۆز هەیە:

بیردۆزی یەکەم: بنچینەی دادوەری دەباتەوە بۆ ئامادەکاریەکی خۆڕسک یان بۆ چەمکی(سەربەستی کەسێتی).

بیردۆزی دووەم: دەڵێت دادوەری چەند ڕێسایەکی ڕەفتارەو جۆرە سزایەک کۆی دەکاتەوە، مێژوو بەپێی بارودۆخ دایاندەنێت. بۆنموونە ڕێساکانی ڕەفتار پەرەدەسێنێت بەڵام ژیری یان تێڕوانینی پوخت سەرچاوەکەی نین! بەڵکو واقیع و شارەزایی واقیع و مێژوو سەرچاوەکەیەتی.

## ٣- فەلسەفەی جوانی:

بابەتێکە لە بابەتەکانی فەلسەفە لە سروشتی جوانی و بابەتەکانی جوانی دەکۆڵێتەوە لەرووی لۆژیکی چێژوەرگرتن وبابەتی جوانیەکە، دیسانەکە ئەو کێشانەی کە لەمیانەی رامان لەسروشتی جوانی وبابەتەکانی جوانی و هونەریەکەی دووچارمان دەبێت چارەسەری دەکات.

فەلسەفەی جوانی هەڵدەستێ بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی چەمکی جوانی و بەها جوانییەکان وەکو سادەیی و رێکوپێکی و هەماهەنگی و بەیەکەوە گونجان، هەروەها هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی بابەتەکانی جوانی سروشتی،وەک دیمەنی دارێک بەرۆخ رووبارێکەوە، هەروەها ئاماژەش بۆ بابەتەکانی هونەری دەکات وەک پەیکەری(شەهرەزاد و شەهریار)و پەیکەری سەربەستی و لایەنە جوانەکانیان دیاری دەکات.

بەهاکانی جوانی چەند جۆرێکن لەوانە:

أ- شێوەییە:بەستراوەتەوە بەپەیوەندییەکانی نێوان ڕەگەزەکانی بابەتەکە.
ب- ماددەییە:بەستراوەتەوە بەو ماددەییەی کە بابەتەکەی لێ پێک دێت.
ج- دەربڕە: بەستراوەتەوە بەو مانایەی بابەتەکە دەری دەبڕێ.

گەر شیعرێک بکەینە نموونە ئەوا شێوەیەکی پەیوەستە بە کێشەکەی کەچی لایەنی مادی وشەکانی بەر گوێچکە دەکەوێ و دەخوێندرێتەوە لەوکاتەدا لایەنی گوزارشتەکی لە بیرۆکە ماناکانی دەردەبڕی. جوانیناسی ئەزموونی جوانی بەهرەی هونەرمەندان دەگرێتەوەو ئەم شاکارانەش تەنها هەر وێژەو هونەر ناگرێتەوە، بەڵکو تێدەپەڕێ بەرەو هزرو فەلسەفەو زانست، بەڵکو هەر تێڕوانینێک و بیردۆزییەکی نوێی و هەر بەرنامەیەکی تازەو هەر کارێکی داهێنەرانەو جێبەجێکردنێک بەگیانێکی ڕووناک سەربارەو بەهرەیەکی نوێیە، کەواتە جوانناسی ئەو زانستەیە کە لە هەستەکان و هەستپێکردن و ئەو خۆشییانە دەکۆڵێتەوە کە دیمەنی شتە جوانەکان پێکی دەهێنن، ئەو ئاستانەش دادەنێت کە شتی جوانی پێ دەپێورێت، واتە لەوە دەکۆڵێتەوە کە شتی جوان و ناشیرین دەبێت چۆن بێت واتە لە جوان و ناشیرین دەکۆڵێتەوە.

## جوانیناسی ئەم کێشانە چارەسەر دەکات:

١- ئایا جوانی بابەتەکییە یان خودییە؟ یاخود لەچییەوە هەست بەجوانی دەکرێت، واتا سروشتی جوانی چییە؟.
٢- پێوەرەکانی جوانی، یان چۆن بەچی جوانی جیا دەکەینەوە؟
٣- پێوەندی نێوان هونەرو ڕەوشت، یان نێوان جوان و چاک یاخود نێوان جوانی و چاکی.
٤- دەوری هونەرەکان لە چاولێکردنی سروشت یان دەرچوون لە واقیع.
٥- سەرچاوەی شاکاری هونەری و،گرنگترین بیردۆزەکان بەپوختی و ڕوونی.

## وتەیەکی کورت و ڕوون دەربارەیان:

**١- جوانی بابەتەکییە یان خودییە،یان سروشتی جوانی چییە؟ لە چییەوە هەست بە جوانی دەکەیت؟**

ئایا جوانی لەخۆیدا هەیە، یان هەستکردن بە جوانی بەندە بەوەی چی لە شتەکە دەبینین و چۆن شتەکە لەبەر چاومان دەردەکەوێت؟ لێرەدا زۆر ڕا هەن، گرنگترینیان دوو خوێندنگەیە،خوێندنگەی یەکەم: جوانی بە سیفەت یان بەخاسیەتی بابەتەکی دادەنێت کە لە خودی شتەجوانەکاندا هەن و، سەربەخۆن لەو ژیریەی کە پێی دەزانێت، وا نەبووایە شتەکان نەدەبوون، کەواتە جوانی لەشتەکاندا هەیە ئەگەر ژیرییەکیش نەبێت درکی پێ بکات. هەرچی دووەم خوێندنگەیە جوانی بە بوونێکی بابەتەکی دانانێت، بەڵکو بۆ ئەو هێزانەی دەباتەوە کە درکی پێ دەکەن بەلایەوە جوانی واتایەکی ژیرییەو سیفەت نیە بۆ شتێک کە لە شتی جواندا بێت و سەربەخۆبێت لە هەموو درک پێکردنێکەوە..

**٢- پێوەرەکانی جوانی، یان چۆن و بەچی جوانی جیادەکەینەوە؟**

هەڵسەنگاندنی جوانی،ئەو ئەو پێوەرەیە کە بەهۆیەوە جوانی جیادەکەینەوەو هەڵی دەسەنگێنین و(چێژ)ی پێ دەووترێت. توانایەکە

مرۆڤ بەهۆیەوە هەست بەخۆشی جوانی دەکات و بە پلەی جیاواز لەکەسەکاندا هەیە، پەروەردەو مەدەنیەت بە پلەی جیاواز لە کەسێک و کۆمەڵێک بەرزی دەکەنەوە. دەنگێک یان دیمەنێک بەیەک شێوەکار لە گوێگر و بینەرانی ناکات، هۆی ئەمەش:

**یەکەم/** پێکهاتنی ماسولکەکان لە هەموو کەسێکدا وەک یەک نییە، بێجگە لە جیاوازی نێوان کەسەکان لە ڕووی مەزاج و پەروەردەو نەریتەوە.

**دووەم/** جیاوازی کەسەکان لە پلەی هۆش وبیردا،هەستەکان بەتەنیا بۆ درک پێکردنی جووڵەو شێوەو دەنگ و ڕەنگ کارناکەن، بەڵکو بیرو هۆشیش بەیەکیانەوە دەبەستێت و ڕێکیان دەخات و، بە پێوەندی یەکانیان دەزانێت. ئەمەش نهێنی ئەو ئارەزووەی مرۆڤە سەرەتاییەکانە لە ڕەنگە زەقەکان، بە پێچەوانەی ئارەزووکردنی ڕەنگی کاڵ لای شارستانییەکان.

دوو خوێندنگەی هەڵسەنگاندنی جوانی هەن: بۆلای کام هێز لەخۆمان چێژ وەرگرتن لەجوانی دەگەڕێنینەوە؟، ئایا بۆ ژیری یان بۆ ویژدان و سۆز. (خوێندنگەی ژیری) بۆ لای یەکەمی دەگەڕێننەوەو بە پێویستی دەزانن کەشاکارە هونەریەکان بکەونە ژێرباری ڕێسا ژیرییەکان و یاساییەکان.

هەرچی خوێندنگەی سۆزداریەکان (ڕۆمانسیەکان)ە دووپاتی ڕەگەزی سۆز یان ویژدان لەچێژوەرگرتنی جوانی دەکات ودان بەوەدا نانێت کەڕێساکان بکەونە ژێرباری (دروستکردنی هونەری بلیمەتانە) .

حوکم دان لەسەر جوانی بەڕای خوێندنگەی یەکەم ژیرییەتی پوختەو، لە حوکمی واقیعیەکانی دیکە کە ستایشی دیاردەکان دەکەن جیاواز نییە. هەرچی.خوێندنگەی سۆزدارییە ڕۆڵی ژیری کەم دەکاتەوە، چونکە حوکم دان لەسەر جوانی یان هەڵسەنگاندنی جوانی ئەوا ویژدانە بەجوانی یان هەست پێکردنە یاخود سوسەزانی ڕاستەوخۆیە دەربارەی ناوەرۆکی شتە جوانەکان.

**٣-پەیوەندی نێوان هونەرو زانستی ڕەوشت:**

دوو بۆچوونی گرنگ هەن: هی وا هەیە ئامانجی هونەر بە ئامانجی ڕەوشت دادەنێت، بەم شێوەیە (چاکی) و (جوانی) یەکسان دەکات و بەئەرکی هونەری دەزانێت خزمەت بە ڕەوشت بکات. پێچەوانەی ئەمە هەیە وتوویەتی هونەر لەجوانی دەکۆڵێتەوەو هیچی دیکەی لە دواوە نییە گرنگ جوانی شێوەی هونەرەکەیە، یان (شێوەکە)یە، هەرچی بابەتە هەر شتێک بێت قەیناکە، با خراپە یان تاوان یاخود چاکە بێت!

**٤- هونەرەکان مەیدانی دەربڕینی جوانین:**

سروشت جوانی تێدایە، بەڵام هونەرەکان ئەو شێوازەن کە مرۆڤ پێوەی جوانی و هەست بەجوانی کردن دەردەبڕێت. لێرەدا گیروگرفتێک دەردەکەوێت: ڕۆڵی هونەرمەند چییە: ئایا تەنها چاولێکەرو لاسایی کەرەوە و لەبەرگرەوەی جوانی سروشتە، یان ڕۆڵەکەی زیادکردنی کامڵبوون و دەربڕی ئەوەی کەدەشێت ببێت، نەک تەنیا وەک ئەوەی هەیە؟ لێرەدا چەند ڕێباوەرێک هەیە:

**أ- ڕێباوەری نموونەیی لە هونەردا یان ڕێباوەری کامڵبوون:**

بەپێی ئەم ڕێباوەرە هونەرمەند لەسەریەتی وا کارەکانی دەربڕێت وەک ئەوەی کەهەن، ویژدان و سۆزی بۆ هونەرەکەی تەرخان بکات، هەر بەگواستنەوەی ڕاستییەکان وەک خۆیان یان لەبەرگرتنەوەی سروشت و جوانییەکەی وەک خۆی نەوەستێت. هەر شتێکیش خراپ و پووچ بێت لەبواری دەربڕینی هونەریدا دووری بخاتەوە.

**ب-ڕێباوەری سروشتی(واقیعی):**

ئەم ڕێباوەرە وای دەبینێت کەتەنیا سروشت بواری هونەرە، لەسەر هونەرمەندە چەند بتوانێت لاسایی سروشت بکاتەوە، تێبینی بکات و هەر ڕاستیەکی شاراوە بخاتە پشتگوێ، کرۆکی شتەکان دووربخاتەوەو لەواقیعی بینراوی سروشت تێ نەپەڕێت چ بەزاڵبوون بەسەریا یان لەخۆیەوە شتی بخاتەسەر، ڕێباوەری سروشتی باوەڕی بە بابەتەکی جوانیی سروشتە، بۆیە ئەم ڕێباوەرە لەدەست تێوەردانی هونەرمەند کەم دەکاتەوە، بەپێچەوانەی ڕێباوەری(ڕۆمانسی).

### ج–ڕێباوەڕی ڕۆمانسی:

ئەم ڕێباوەڕە لە دواییەکانی سەدەی هەژدەم و پاش ئەوە پەیدابووە، جەخت لەسەر لایەنی سۆزو هەست و ویژدان و تێگەیشتنی ڕاستەوخۆ بۆ سروشت و جوانییەکەی دەکاتەوە، لەکاتێکدا لە ڕۆڵی ژیریی کەم دەکاتەوە. باوەڕی وایە کە هونەرمەند دەورێکی گرنگی لە درک پێکردنی جوانی یان دەربڕینیدا هەیە، لەبەر ئەمە بە پێویستی دەزانێت کە هونەرمەند دەست وەربداتە سروشت نەک هەر لێی بگوازێتەوە. ئەم ڕێباوەرە کاری ڕاستگۆیی لە دەربڕین و شتی هەرلەخۆوە و ئەندێشە و سۆزو گاڵتەکردن بەژیری ولۆژیک بەگەورە دادەنێت. بەلایەوە هونەرمەند پێویستە بەسەربەستیەکی تەواو ئەوەی هەیەتی دەری ببڕێ، بێ گوێدان بەشتێک یان بەخۆبەستنەوە بە کۆتێک جاهەر ڕێسایەک بۆ کاری هونەری هەبێت.

### ٤– لۆژیک (المنطق):

ئەگەر بابەتی فەلسەفەی ڕەوشت چاکە بێت و بابەتی فەلسەفەی جوانی، جوانی بێت،ئەوا بابەتی لۆژیک ڕاستییە. لۆژیک واپێناسەکراوە کە زانستی بیرکردنەوەی ڕاستە، یان زانستی یاساکانی بیرە، جابابەتی بیر هەر چییەک بێت. ئەم پێناسەیە بەپێی لۆژیکی شێوەیی ڕاستە، ئەو لۆژیکەی کە(ئەرستۆ) بنچینەکانی داناوە تا دەرکەوتنی جۆرەکانی لۆژیکی نوێ باوبوو. لۆژیک ناسانی نوێ نکوڵی لەوە ناکەن کە لۆژیک زانستی بیرکردنەوەیە کە ڕاست و هەڵە لەیەک جیادەکاتەوە، بەڵام بەرنامەی تاقیکاریان لەگەڵ داوە، لەبەر ئەمە لای ئەمان بووە بە زانستێکی ستایشیانە، کەچی لای پێشووەکان زانستێکی پێوانەییانە بوو، واتە لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی ئەوەی کە بیرکردنەوەی دروست دەبێت چۆن بێت، بۆیە پێشووەکان وایان داناوە کە زانستێکی پێوانەیی یان تەرازوو یاخود ساغکەرەوەی بیرە، بیرناسانی پێشوو لۆژیکیان بەئامرازو دەروازەیەکی زانستەکانیان دانابوو، ئێستاکە لۆژیک لەوبابەتانەیە کەلە ناخی فەلسەفەدایە، لۆژیکی کۆن بە(شێوەیی) ناوبراوە، چونکە بابەتەکەی شێوەی زانستە.

## یاساکانی بیر بەپێی لۆژیکی کۆن سێ پرەنسیپە:

**یەکەم:** پرەنسیپی خۆیەتی (یاخود ناسنامە): مانای ئەوەیە هەموو شتێک هەر ئەوەیە کە هەیە، بە دەربڕینێکی دیکە شتەکە خۆیەتی (ئەلف ئەلفە). بوون نەبوون نییە، یاخود هیوا هیوایەو کەسێکی دیکە نییە.

**دووەم:** لەوەی یەکەم پرەنسیپی دووەم وەردەگرێت کە (پرەنسیپی ناپێچەوانە)یە، شتێک ناشێت ئەو بێت و ئەو نەبێت لەیەک کاتدا (ئەلف نا ئەلف نییە)( بوون نەبوون نییە)(هیوا ناهیوا نییە).

**سێیەم:** پرەنسیپی لابراو: شتێک یان دەبێت یان نابێت (یان ئەلفە یان ئەلف نییە) واتە هیوا یان زیندووە یان مردووە ناشێت لەهەمان کاتدا زیندوو بێت و مردووش بێت یان لەهەمان کاتدا دیار بێت و دیار نەبێت، یاخود ئامادە بێت و ئامادە نەبێت. جا لەبەرئەوەی کە بابەتی لۆژیک بریتین لەکردەوەکانی ژیریی(هۆش) لەڕووی دروستی و نادروستی، لەهەمان کاتدا کردەوەکانی ژیریش کە سێ شت بن کەبریتین لە تێڕوانین، پەسندکردن یان بڕیاردان، بەڵگەهێنانەوە، کەواتە لۆژیک واتای ئەم سێ شتانە ڕوون دەکاتەوە:

### ١- تێڕوانین:

زانینی ڕاستی شتە بێ ئەوەی حوکمی لەسەر بدرێ بەئا یان نا، کە لێکۆڵینەوەی چەمکەکان لەڕووی چییەتی و پێناسەکردنیان دەگرێتەوە. تێڕوانین یەکەم کاری ژیرییە کە بریتییە لەهەستکردن بەشتەکان و ڕوانین بۆ ماناکەی، ودرک پێکردنی تاکە وەک هیوا،ئەگەر ماناکە زۆری دیکەی گرتەوە ئەوا دەبێتە (چەمک) وەک چەمکی مرۆڤ لەهیوا و نازدار.

### ٢- پەسندکردن یان بڕیاردان:

بریتییە لە گونجاندنی هزر(بیر) لەگەڵ واقیعداو بڕیاردان لەسەر بەڕاست دانانی یان بەدرۆخستنەوەی، کەجۆرەها کێشەبەدوای خۆیدا دێنێ. پەسندکردن بریتیە لە جیاوازی کردن یان بەراوردکردن لەنێوان دوو هزر،واتا یان بیسەلمێنین یان ڕەتی بکەینەوە کە خەڵوز ڕەشە یان ڕەش نییە.

### ٣- بەڵگە هێنانەوە:

گواستنەوەی ژێرییە لەو کێشانەی کە سەپێنراون بۆ هی دیکە کە لێیان وەرگیراوە، واتە ئەنجام دەرهێنانی نەزانراو لە زانراو کە: یان بەڵگە هێنانەوەی ڕاستەوخۆیە، وەک ئەنجام دەرهێنانی: هەندێ ئەفریقی مەغریبین لەوەی کەهەموو مەغرییەک ئەفریقییە. یاخود بەڵگە هێنانەوەی ناڕاستەوخۆیە ئەم دواییە پێوانەیە، دەبێت نێوانێکیان ببێت وەک بڵێین: (هەموو مرۆڤێک نامێنێت و سۆکرات مرۆڤە، کەواتە سۆکرات نامێنێت).

ئامانجی لۆژیک تەنها دۆزینەوەی ڕاستی نییە، جا ئەو ڕاستییە بیرکاری بێت یان فیزیایی و مێژوویی و دەروونی و کۆمەڵایەتی بێت، ئەمە ئەرکی زانایان و پسپۆڕانی هەر زانستێکە لەو زانستانە. هەر زانستە شێوازو بەرنامەی خۆی هەیە، ئەوەی بەلای لۆژیک گرنگ بێت زانینی ئەو مەرجانەیە کە وایان کردووە ڕاستی شیاو بێت. لەم ڕووەوە زانیاری لۆژیک سێ تایبەتمەندی هەیە:

**یەکەم**: لۆژیک (المنطق): جۆرێکی زانیاری شیکارییە: واتا زانیاری لە درک پێکردنی ڕاستییەوە بۆ زانینی مەرجەکانی ڕاستی بەرز دەبێتەوە.

**دووەم**: لۆژیک جۆرێکی زانیاری ڕەخنەییە: هەوڵ دەدات ڕاست و ناڕاست لەو مەرجانە لەیەک جیابکاتەوە ودەری بخات کامیان وردترن بۆ گەیشتنە ڕاستی و دەربڕینی.

**سێیەم**: لۆژیک جۆرێکی زانیاری پێوانەییە یان بەهاییە: نە لەبیرکردنەوە دەکۆڵێتەوە وەک کە هەیە، نەلە واقیع دەکۆڵێتەوە، بەڵکو لەبیری ڕاست و دروست دەکۆڵێتەوە، واتا بیر دەبێت چۆن بێت لە چوارچێوەی ئەو مەرجانەی کەوای لێدەکەن لەگەڵ خۆی و لەگەڵ واقیع دا گونجاو تر بێت. لێرەدا لۆژیکناس لەگەڵ دەروونناس و مێژووناس و سرووشتناس جیاوازە، لە ڕووی ئەوەی ئەوان لە واقیعی دەروونی و مێژوویی و سروشتی دەکۆڵنەوە وەک خۆیان کە هەن نەک وەک ئەوەی کەدەبێت وابن یان وا ڕووبدەن. کەچی ڕۆڵی لۆژیکناس بەدواچوونی ئەو هەنگاوە بیریانەیە کە هەریەک لەوان بۆ گەیشتنیان بەڕاستی پەیڕەویان کردووە.

## ٥- فەلسەفەی زانست:

لەبەرئەوەی کە فەلسەفەی زانست لەدەرەنجامەکانی پەرەسەندنی زانستەکانی سەردەمی نویٚ بووە، فەیلەسوفان هەوڵیان داوە، بایەخ بەزانستەکان بدەن، ولە ڕووی بەرنامەو لۆژیکەوە لیٚیان بکۆڵنەوە، وپیٚکهاتن و دامەزراندنی بیردۆزی زانستی خراوەڕوو شیبکەنەوە. فەلسەفە هەر لەکۆنەوە بایەخی بەزانیاری زانستی داوەو زۆربەی فەیلەسووفانی یەکەم زانابوون و لەسەردەمی ڕیٚنساسدا شیکردنەوە زانستییەکان ڕاستەوخۆ کاریان کردۆتە سەر ئاراستە فەلسەفییەکان، بۆ نموونە هەروەک لەفیزیای نیوتن ڕوویداوە. یان هەروەک لەدۆزینەوە نویٚیەکانی گەردیلەو دامەزراندنی ڕوویداوەو ڕوودەدات. فەلسەفەی زانست پسپۆریەکی گرنگە لە پسپۆریەکانی فەلسەفە کە فەیلەسووف و زانا ناتوانن دەستی لیٚ هەڵگرن. بەشیٚوەیەکی سادە ئەوەیە کە فەلسەفەی زانست فەلسەفەکاریە دەربارەی زانست لەدواییدا فەلسەفەی زانست هەر فەلسەفەیەک یان فەلسەفەکاریەک دەربارەی زانست یان لایەنیٚک لە لایەنەکانی دەگریٚتەوە. بۆ نموونە ئەوەی خەریکی فەلسەفەی زانستە بۆی هەیە خەریکی لایەنە میتافیزییەکان (ئەودیو سروشت) ی زانست بیٚت. واتە فەیلەسوفی زانست چی دەتوانیٚت دابمەزریٚنیٚت دەربارەی خستنەڕوویەکی زانستیانەی گەردوون یان مادده یاخود ژیان لەدامەزراندنیٚکدا کە پەیوەندی بەبنچینەی گەردوون و سروشتی و هۆیەکانی و مەبەستەکانی بیٚت. فەیلەسوفی زانست بۆی هەیە زانست ببەستیٚتەوە بە ڕەوشت و ڕاستی وجوانی پاشان پرۆژەیەکی مرۆڤانەی لیٚ دروست بکات هەروەها بۆی هەیە لەمیٚژووی زانست و ئەو پیٚشکەوتنەی بەسەریدا هاتووە بکۆڵیٚتەوە لەگەڵ لیٚکۆڵینەوە لەکردەوە دەروونی وژیرییەکان کە پەیوەندیان بە دۆزینەوە زانستیەکان هەیە. هەرچۆنیٚک بیٚت کارکردن لە فەلسەفەی زانست دوو مەرجی هەیە:

**یەکەم:** فەیلەسوفی زانست دەبیٚت خاوەن بەرنامە بیٚت بەشیٚوەیەک کە خستنەڕووە زانستیەکان لەسەر بنچینەکانی ئەو بەرنامەیە لیٚک بداتەوە.

**دووەم**: فەیلەسوفی زانست دەبێت بزانێت کە زانست بابەتی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەکەی و کەرەستە خاوەکەیەتی ئەویش بۆ دووپات کردنەوەی ئەو راستیەی کە دەڵێت فەلسەفە لەو شوێنە دەست پێدەکات کە زانستەکانی لێ وەستاوە.

## ٦- فەلسەفەی مێژوو:

بایەخ بەلێکدانەوەی تێکڕای مێژووی مرۆڤایەتی دەدات لەسەر بنچینەی بیردۆزێکی گشتی، دەتوانرێت وەک نموونەی یەکەم ڕوونکردنەوە باسی بیردۆزی ئەو چاخانەی شارستانیەت بکرێ کە ئیبن خەلدون دایناون یاخود ئەوەی پێی دەوترێ لێکدانەوەی (ئاوەدانکردنەوە)یانیش بیردۆزی(پێشکەوتن) کە لەسەدەی هەژدەمدا جێی بیردۆزی (ئاگایی ئۆگستین)ی گرتەوەولەپاشان (ڤیگۆ) بەدوای ئیبن خەلدون دا هات کە دەیووت پێشکەوتنی ژییری مرۆڤ سێ قۆناغی بڕیوە کە لەپاشدا ئۆگست کۆنت پەرەی پێداو وتی: هەموو مرۆڤایەتی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە کە ئەمانەن: قۆناغی ئەفسانەیی و قۆناغی فەلسەفی (یان میتافیزیکی) و قۆناغی زانستی. یەکەمیان پێش فەلسەفەی یۆنان بووە، دووەمیان لە فەلسەفەی یۆنانییەوە تا کۆتایی سەدەی هەژدەم درێژەی هەبووە،دواجار قۆناغی زانستی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە دەست پێدەکات تا ئێستا. نموونەی سێیەم مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر بنچینەی هۆکاری دەوروبەر یان چاکی و زۆری خۆراک لێک دەداتەوە کە(تۆماس بیکل) باسی لێوەکردووە. نموونەی چوارەم لێکدانەوەی مێژوو و شارستانیەت وئاوەدانکردنەوەیە لەسەر بنچینەی دەوروبەرو ئابووری و کۆمەلایەتی و دەروونی پێکەوە، هەروەک ئەوەی (ئیبن خەلدون) لە کتێبی (المقدمة) ی خۆی دا لێکی داوەتەوە،شایانی باسە ئیبن خەلدون بە دانەری راستەقینەی فەلسەفەی مێژوو دادەنرێ. هەروەها فەلسەفەی مێژوو بنچینەیەکی فەلسەفی بۆ زانستی مێژوو دادەنێت بە پوختەکردنی ئەو بەرنامەیەی کە مێژوونووسان دایدەنێن چ بەتاقیکاری بێت یان لێوەرگرتن بێت! لەگەڵ

تاوتوێ کردن وشیکردنەوەی سەرچاوە مێژووییەکان،ولێکۆڵینەوەی ئەو زاراوە گشتییانەی کە مێژوونووسان بەکاریان دەهێنن لە هۆکار ومەبەست و هتد. فەلسەفەی مێژوو هەر بایەخ بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان نادات! بەڵکو وای دەبینێت کە مرۆڤایەتی بە پێی یاسای جێگیر دەڕوات کە کات و شوێن دەبڕێت و بە پێی حەز و ڕێکەوت ناڕوات، هەروەها لە ئەرکەکانی فەلسەفەی مێژوو ئەوەیە کە ئەو یاسایانە بدۆزێتەوە کە مێژووی مرۆڤایەتی لێک دەداتەوە بە شێوەیەکی یەکگرتوو ویان بەشێوەی چەند هێڵێکی تەریب بەیەکتر. لەبەناوبانگترین فەیلەسووفانی مێژوو: ئۆگستین و ئیبن خەلدون و ڤیکۆ و هیگل و ئۆگست کۆنت و مارکس و توێنبی و کەسانی دیکەن.

**٦- فەلسەفەی ئایین:** لێرەدا دەبێت فەلسەفەی ئایین و لاهووت لەیەک جیا بکەینەوە. ئەوەی دووەم لە فەلسەفەی ئەم ئایینە دیاری کراوە یان ئەویان دەکۆڵێتەوە (بۆ نموونە قسەناسی کریستیان و قسەناسی ئیسلامی). هەرچی فەلسەفی ئایینە بایەخ بە شیکردنەوەی ئەو چەمکە گشتییانە دەدات کە ئایینەکان بەکاریان دەهێنن. ئەگەر (لاهووت) هەوڵی ئەوە بدات بەرگری لەباوەڕی ئەم ئایینە یان ئەویان بکات بە بەڵگەو لۆژیک ئەوا فەلسەفەی ئایین ئەم مەبەستە دیاریکراوەی نییە، بەڵکو لەدیاردە گشتییەکانی ئایینداری و ئەم چەمکە گشتییانە دەکۆڵێتەوە کەزانستەکانی ئایینە تایبەتەکان بەکاریان دەهێنن.

فەلسەفەی ئایین لە ڕابووردودا بەشێکی (میتافیزیک) بووە، لەپاشدا لێی جیا بۆتەوە. لە ساڵانی دواییدا سێ ئاراستەی گرنگ دەستیان دایە لێکۆلینەوەی فەلسەفەی ئایین: ئاراستەی مێژوویی کە مەبەستەکەی لێکۆڵینەوەی بنچینەی ئایینەکان و پەرەسەندنی بیرۆکەی ئایینیە. ئاراستەی دەروونی زانیارییانە کە مەبەستەکەی باسکردنی ئەو بارە دەروونیانەیە کەژیانی ئایینی لە سەریاندا دادەمەزرێت، ئاراستەی فەلسەفی کە ئەرکەکەی داواکردنی ئەو بەڵگانە بووە کە بیردۆز و باوەڕە ئایینییەکان دەروژێنن.

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

١- بابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفەو لقەکانی چین؟

٢- مەبەست لەبابەتی (بوون) چییە؟

٣- تیۆری زانین چییە؟

٤- مەبەست لەزانیاری هەستی و زانیاری ژیری چییە؟

٥- دەربارەی هەست خەڵتێنەکان نموونەیەک بێنەوە، ئایا ئەوە وات لێ دەکات بەتەواوی پشت بەهەستەکانت ببەستیت؟

٦- مەبەست لەفەلسەفەی بەهاکان چییەو لقەکانیش کامانەن؟ باسی یەکێک لەوانە بکە؟

٧- قسە لە فەلسەفەی جوانی بکە؟

٨- ئەو بیردۆزانە چین کە لێکۆڵینەوەی شاکاری هونەرییە؟

٩- مەبەست لەفەلسەفەی مێژوویی چییە؟

١٠- لۆژیک پێناسە بکەو گرنگییەکەشی ڕوون بکەوە؟

١١- مەبەستمان لە فەلسەفەی یاسا چییە؟

١٢- مەبەست لە فەلسەفەی زانست چییە؟

١٣- جیاوازی لە نێوان فەلسەفەی ئایین و لاهوت چییە؟

١٤- میتافیزیک چییەو خوێندنگە گرنگەکانیش کامانەن؟

# بەشی چوارەم

## خستنەڕووی مێژووی فەلسەفە لە شارستانێتیە کۆنەکاندا

### پێشەکی:

### گرنگی مێژووی فەلسەفە:

لێکۆڵینەوە لە مێژووی فەلسەفە وامان لێ دەکات لە کاروانی هزری(بیری) مرۆڤایەتی ویاساکانی تێبگەین وئەزموونە مێژووییەمەزنەنەکەی زانیاری مرۆڤ بۆ جیهان وەربگرین.مێژووی فەلسەفە چۆنێتی دەرکەوتنی شێوەکانی بیری بیردۆزیی و ڕێگاکانی زانینی زانیاریمان بۆ دەخاتە ڕوو. هەروەها فێری ڕێگای دروستی بیرکردنەوەو بەکارهێنانی زانیاریمان دەکات بۆ گۆڕینی جیهان، یەک لە بیرمەندەکان دەڵێت: (بیرکردنەوەی بیردۆزیی شتێکی تایبەتی سروشتیە(غەریزیە)، بەڵام تەنیا بە شێوەی خووێک یان ئامادەکاری، دەتوانرێ پەرەی پێبدرێت، تاکو ئێستاکەش هیچ هۆیەک نییە بۆ ئەوە تەنها لێکۆڵینەوەی هەموو فەلسەفەی رابردوو نەبێت).

مێژووی زانستی فەلسەفە بنچینەکانی ڕێبازە فەلسەفەییەکان و هۆکارە شاراوەکانی پشت ئەمە دەردەخات و هیواو متمانەش لەناخی مرۆڤ دەڕوێنێ و دەیبەستێتەوە بەهێزی ژیری مرۆڤایەتی و تواناکەی بۆ ناسینی جیهان و یاساکانی . لەپاڵ بایەخە زانیاریەکەیەوە، لێکۆڵینەوەی مێژووی فەلسەفە بایەخێکی ڕامیاری وکرداریی و پەروەردەیی دەبەخشێ. هەروەها مێشکی مرۆڤ بەو زانیاریە فەلسەفیانە دەوڵەمەندتر دەکات کە مرۆڤ لەماوەی کاروانە درێژەکەیەوە دایهێناون. یارمەتیشی دەدات بۆ وەرگرتن و پەرەپێدانی چاکترین دابەکانی ئەو بیرە. بەڵگەو نموونەو توانا بە مرۆڤ دەدات بۆ وەدیهێنانی تایبەتە سەرەکییەکەی خۆی کەبیرو خۆشویستنی زانیارییە.

فەرامۆش کردن و گوێنەدان بەرابردووی بیرکردنەوە لە فەلسەفەدا

ناکرێت، چونکە مێژووی فەلسەفە بریتییە لە فەلسەفەو بەردەوام لە نوێبوونەوەو پەرەسەندنێکی بەیەکەوە بەستراو دایە. ئەم گیروگرفتە فەلسەفیانەی کە فەیلەسوفەکانی پێشوو لێیان دواون تا ئێستاکەش ماون و لە دوارۆژیشدا دەمێننەوەو بابەتەکانیان نەگۆڕاون هەرچەندە توخمی نوێی خراوەتە سەر.

## قۆناغەکانی یان دابەشکردنە سەرەکییەکانی مێژووی فەلسەفە:

نووسینی فەلسەفە لە خۆرئاواو لای زۆربەی نووسەرەکانی کۆن تا سەردەمانی زووش بەفەلسەفەی یۆنان دەستی پێکراوە(سەدەی ٦ پ.ز) بگرە بەچەند لاپەڕەیەکی کەمیش بەلای فەلسەفەی ئیسلامی نەچوون سووریشن لەسەر ئەوەی کە لە خۆرهەڵاتی کۆن (چین و هیندو میزۆپۆتامیا و دۆڵی نیل) فەلسەفە نەبووە.

ئێمە دەربارەی مێژووی فەلسەفە پەیڕەوی ئەم دابەشکردنەوەی خوارەوە دەکەین:

**١- فەلسەفەی خۆرهەلاتی لە هیندو میزۆپۆتامیا و دۆڵی نیل.**

**٢- فەلسەفەی یۆنان و فەلسەفەی ڕۆمان.**

**٣- فەلسەفەی ئیسلامی.**

**٤- فەلسەفەی نوێ، لە سەردەمی بوژانەوەی ئەورووپا و دوایی ئەو سەردەمە.**

**یەکەم:** پەیدابوونی ڕێبازەکانی هزری(بیری) و فەلسەفی لە هیندو میزۆپۆتامیا و دۆڵی نیل:

لە زۆر کۆنەوە شارستانیەتی ڕەسەن لەناوچەکانی خۆرهەڵات دەرکەوت ومرۆڤەکانی نێو ئەو شارستانێتیانە هەمیشە سووربون لەسەر (دروست کردنی ژیان)وڕەخساندنی سروشتێکی لەبار.

لێرەدا: تەنیا لە دوو بنکە لە بنکەکانی شارستانێتیە کۆنەکان دەدوێین کە(میزۆپۆتامیا و دۆلی نیلە).

## ١- بیروڕا هزری و فەلسەفییەکان لە میزۆپۆتامیا:

بیرکردنەوە لە میزۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە بۆ چاخە بەردینەکان، شارستانێتی سۆمەرییەکان بە کۆنترین شارستانێتی ناوچەکە دادەنرێت و سۆمەریەکان لەباکوری میزۆپۆتامیا(کوردستانی ئەمرۆ) کۆچیان کرد بۆ باشوری میزۆپۆتامیا. وشارستانێتی سۆمەریەکانیان دامەزراند،شارستانی سۆمەریەکان بەرهەمی ئاو و خاکە، ئەم دوو توخمە (ئاو و خاک) پێویستیەکانی کشتوکاڵی لە خاکی لەبار و خانوو لە قوڕ(گڵ) و سواڵەت و خشتی نەخش و نیگارو نووسینی بۆ دانیشتوانی نێوان دیجلەو فوڕات سازدا بوو، چونکە سۆمەرییەکان وا یان بەبیردا دەهات، کە مرۆڤ لە ئاو و گڵ (قوڕ)دروستکراوە. لە پاشان خێڵ ونەتەوەکانی کە لە دورگەی عەرەبەوە هاتن، وەک ئەکەدییەکان و ئاموریەکان و هی دیکە لە میزۆپۆتامیا و وڵاتی شام و میسر نیشتەجێبوون وشارستانێتی هەموولایەک ئاوێتەی یەکتربوون. حامورابی(١٧٩٨پ ز - ١٧٥٠ پ ز) شەشەم پادشای دەوڵەتی بابلی یەکەم، لەهەموو پادشاکانی دیکە زیاتر بایەخی بەیاساو دانانی دەستور و دادپەروەری داوە ئەو شوێنەوارو پاشماوە کۆنانەی کە لەناو جەرگەی زەویدا دۆزراونەتەوە، هەموویان ئەو بیرە فەلسەفیانە دەخەنە ڕوو، کە لەبارەی بوون( گەردوون) و ژیان(مرۆڤ) دەسووڕێنەوە، وەک لە (چیرۆکی ئافەریدە= خالق) و (داستانی گلگامێش)و چەندان دەقی دیکەدا لە زمانە کۆنە ڕەسەنەکان بە دەردەکەوێ.

ئێمە دەتوانین ئەم بیرو ڕایانە بکەین بە سێ بەشەوە:

### أ- هزرە فەلسەفییە گەردوونی و سروشتییەکان:

دەرکەوتنی بیری فەلسەفی لە میزۆپۆتامیا بە هەنگاوە یەکەمەکانی زانستە سروشتییەکانی وەک گەردووناسی و بیرکاری لە لایەکەوە، وبە ئەفسانەوە لەلایەکی دیکەوە بەسترابۆوە. فەلسەفە بە واتا ڕێک و تایبەتمەندییەکەی وەک شێوەیەکی جیا لە شێوەکانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی هێشتا دەرنەکەوتبوو. پەرەسەندنی کشتوکاڵ و

ئاودێری وبیناسازی پێویستی بە فراوانکردنی زانیارییە زانستییەکان بوو بۆ بەکارهێنانیان لەژیانی کرداریدا، پێویستییەکانی ژیان، پێویستی بە دانانی ڕۆژژمێرێکی ڕێک بوو بۆ چاودێری مانگ و خۆرو ئەستێرەکان، کەئەمەش رۆڵی هەبوو لە پێشکەوتنی زانستەکان.

بابلیەکان بنچینەکانی جەبرو ئەندازەیان دانا، ڕێبازێکی نزیک بە ڕەگی دووجایان دۆزییەوەو چۆنیەتی شیکارکردنی هاوکێشەی پلە دوویان خستەڕوو، هەروەها بابلییەکان سیستەمی (شەستی)یان لە ژمێرکاریدا داهێنا کە تاکو ئیمڕۆکە لەهەموو لایەکی جیهاندا بەکاردەهێنرێت (١کاتژمێر ٦٠خولەکەو ١خولەکیش=٦٠چرکە).

رامانە فەلسەفیە یەکەمینەکان بە یەکەم هەوڵدانی بیرمەندە کۆنەکانی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا دادەنرێ، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی بە تێگەیشتنی دیاردەکانی گەردوون و دەربڕینی خەم و تێڕوانینەکانی مرۆڤەوە هەیە.

ئەو بیرکردنەوە سەرەتاییانە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە پەیدابوون و سەرهەڵدانی بیری(هزری) فەلسەفی لەنێو دانیشتوانی میزۆپۆتامیا،و ئەفسانەکان بەرە بەرە گۆڕان بۆ بیروباوەڕی بیری و فەلسەفی سەبارەت بەنەژادو بنج و بناوانی جیهان و دەرکەوتنی بوونەوەرەکان (موجودات) یەک لەدوای یەک. لەبەر ئەوە دەبینین ئەدەبیات لە میزۆپۆتامیا پڕە لەچیرۆکی ئافەریدە(خەلیقە)و چیرۆکی گەڕان بەدوای نەمری و بەدوای ژیان دا. لێرەدا تەنیا وێنەیەکی سەرتاپاگیریتان بۆ دەهێنینەوە دەربارەی ئافەریدە (خەلیقەت).

باوەڕە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا (ئاو) بە سەرچاوەی هەموو بونەوەری دیکە دادەنێت، بەڵام گەڕان بەدوای ژیان و نەمری، ئەوا لە داستانە بەناوبانگەکەی گلگامێش ئاماژەی پێکراوە،ئەم داستانە بۆمان بەدەردەخات کەچۆن گلگامێش بەمردنی (ئەنکیدۆ)ی هاوڕێی، پەرێشان بووەو حەپەساوەو بەدوای ئەوەدا گەڕاوە، چۆن زیندوی بکاتەوە، مەرهەمێ دابهێنێ، یان بدۆزیتەوە، مرۆڤ لەچنگ مەرگ رزگار بکات. هێماکانی

داستانەکە ئاماژە بۆ بیرە فەلسەفیە قوڵ و بەرزەکان دەکات گەر چی بەلۆژیک ودارشتنی فەلسەفی گوزارشتی لێ ناکات. گەورەترین شتێ کە شارستانییە کۆنەکانمان پێشکەش بەمرۆڤایەتی کردووە، دۆزینەوەی نووسین و تۆمارکردن و سەرکەوتنیان بووە لە بواری گواستنەوەی (بیروڕاکان) بۆ (هێما)، پاراستنی ئەمانە لەسەر تاتەقوڕی سوورکراوە بووە کە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێنەوە.

ئەم بیرو هزرانە، هەوڵیان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە:

بنچینەی بوون چییە و هۆی پەیدابوونی چییە، چۆن شتەکان دۆزراونەتەوە؟

سەرچاوە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا لەسەر ڕاستی گەردوون وەها پێکهاتوون کە دەڵێن: هەموو بونەوەرەکان (موجودات) بە مرۆڤیشەوە، بە لە دایکبوون هاتوونەتە کایەوە، هیچ شتێ لەدوو هۆکار بەدەر نییە: (دایک و باوک) بەواتای نێرو مێ. بۆیە سەرچاوەی یەکەمی پەیدابوون وبنەڕەتی بونەوەریش(ئاوە) ئاوی پیرۆز کە لەدوو توخمی نێرو مێ کارلێک دەکەن، واتە پەیدادەبن بەهۆی هێزێکی نادیار کە لەئاوەکەدا هەیە، دەتوانێ ئەم ئاوە ژیان بکاتە بەر بوونەوەرەکان وهێزی بوژانەوەی ژیان و پێکهاتەی بوونیان پێ ببەخشێت، بۆیە دەبینین هەموو بوونەوەرێ پێویستی بەئاو هەیەو ناتوانێ بێ ئاو ژیان بگوزەرێنێ. نە مرۆڤـ نە گیاندار نە ڕووەک بەبێ ئاو ناژی. ئاو شتێ نەبووە کەچی لەئاو هەرچی زیندەوەر و گیانلەبەرە دروست بووە، وهیچیان ئەمانە بەبێ ئاو هەڵناکەن، ئەمەش لەقورئانی پیرۆزدا بە ڕاشکاوی هاتووە و خوای مەزن دەفەرموێ هەموو شتێکی زیندوومان لەئاو دروست کردووەو گیانمان کردووە بە بەریدا(وجعلنا من الماء كل شيء و حي) (سورەتي الانبياء - ئايەتي ٣٠). هەروەها لەدەقە کۆن وپیرۆزەکانیشدا هاتووە کە:(مرۆڤ لەڕوحی قوڕ دروست کراوە، ئەو قوڕەی کە لە ناخی دەریا قوڵەکاندا دەرهێنراوە، چونکە ئەو جۆرە قوڕە زۆر پاک و خاوێنە)، بۆیە: دەگوترێ: مرۆڤ بەخاوێنی دروستکراوە وسروشتی پاکەو لەهەموو پیسییەک بەدوورە — لەم بوارەدا بیروڕای

جۆراو جۆر هەیە.

پوختەی لێکدانەوەی گەردوونی لە میزۆپۆتامیادا (لەدوای لابردنی لایەنە داستانیەکەی) پێمان دەڵێ: ئەم گەردوونە بازنەیەکی رێک و پێکە وزیندەگی و چالاکی پێوە دیار دەبێ وهەموو شتێ لەپێناوی (ئامانج)ێک دا دێت و دەچێ، واتە بە دەوری ئامانجێکدا خول دەخوات، ئەو ئامانجەش گوێڕایەلی خواوەندە(الالهة) بۆ گەیشتن بە بەختیاری مرۆڤ ئەوەی کە لەسەر زەوی روودەدات(نیوەی خوارووی گۆی زەوی، بوونی تەواوە) دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەکانی بوون لەئاسماندا (نیوەی سەرووی گۆی زەوی) لە بازنەی بووندا. لەسەر ئەم بنچینەیە سیفەتی تەواویان داوە بە بوون، چونکە باوەڕیان وا بووە کە بازنە تەواوترین شێوەکانی ئەندازەیە و کۆی پلەکانی دەکاتە (٣٦٠) پلە بەهەر چوار گۆشە وەستاوەکەیەوە، کە هاوتان لەگەڵ یەکدیدا لە خاڵی مەرکەزی (ناوەراست)و ماوەیەکی وەک یەک دوورن (تیرەکان و نیوە تیرەکانی ئەندازەیی).

### ب- بیر(هزر)ە ڕەوشتیی و کۆمەڵایەتییەکان:

بەڵام مەسەلەی چاکە و خراپە و دادپەروەری و شتی ڕەواو نا ڕەواو و بەختیاری و کوێرەوی، کە شوێنەوارەکانی عێراقی کۆن لێی دەدوێن، وەک (ئارامگری ئەیوب) و (یاساکانی میلەکەی حامورابی) و (چاکسازی ئۆرکاجینا) و (پەندی ئەحیقار) و (دوورگەی بەختیاری و نەمری دلمون) ئەمانە هەموویان بابەتی(فەلسەفەی ڕەوشتین) لە زاراوەی هاوچەرخدا، چونکە بیرمەندە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا، باوەڕیان بە سروشتی چاکە هەبووە و لە هەمان کاتدا باوەڕیشیان بە خراپە هەبووە لە مرۆڤدا، لە هەمان کاتدا دیسان باوەڕیان بەوە هەبووە کە لە دوا دیاردەکانی زۆرداری و کوێرەوەرییەوە شتی دیکە هەیە، لێرەدا نامانەوێ لەوە زیاتر پەرە بە دوانەکەمان بدەین، چونکە باسەکە دوورو درێژ وفراوانە - بە هەر حاڵ ئەم بیروڕایانە دابەش دەکرێن بەسەر دوو جۆر بۆچوون:

**یەکەم**: گوتراوە لە مرۆڤدا، ئارەزووی چاکە و ئارەزووی خراپەش هەیە،

چونکە هەر بەم شێوەیە دروست بووە.

**دووەم**: دەگوترێ، مرۆڤ چاکەی لە سروشتیدا هەیە، چونکە لە قوڕێکی پاک دروووستکراوە، بەڵام خراپەکاری (شەڕانگێزی) لە ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیدا دەرگای پێگرتووە و کاری تێکردووە بە چاک و خراپ کاردەکاتە سەر بارودۆخی گشتی و ئەو ژینگەیەی مرۆڤ و کۆمەڵی تێدا دەژی.

بیرمەندە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا بە بیرو و هۆش و دووربینی خۆیان و ئەزموونەکانیان لە ژیاندا درکیان بەوە کردووە کە مرۆڤ، گیاندارێکە و چارەنووسی ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر (مردن) ە. ئینجا بۆ ئەوەی لە (مەرگ) نەسلەمێتەوە و نەترسێ هاتووە رووی کردۆتە کارکردن و دروستکردنی (خانوو) بۆ خۆی و دەستکەوتی گەورەی بەرهەمهێناوە بۆ خزمەتکردنی مرۆڤ، بۆ ئەوەی بیروباوەڕ و کاری جوان لە پاش خۆی بەجێ بهێڵێ. کارێکی وەها بکات خەڵکی لە یادی نەکەن و مێژووش هەرگیز توانست و هێز و وزەی ژیری و توانای جەستەیی لەبیر ناکات، کە بۆخزمەتکردنی هاوڕەگەزەکانی ئەنجامی داوە و بەرەو پێش و بەرزبوونەوە پاڵی پێوەناوە هەتا بەرەو پلەی شارستان پێشکەوتن بردوویەتی، ئەم سەرکەوتن و شارستانیەش تەنیا بە خۆدورخستنەوە لە زوڵم و زۆرداری و هۆیەکانی و ئەنجامەکانی نەبێت – بە تاک، یان بە کۆمەڵ- پێک نایەت و مرۆڤ لە سایەیدا ناحەوێتەوە.

ئینجا لە پێناوی (بەربەستکردن) ی پاڵنەرە خراپەکارییەکان لە هەندێ دڵا و دەروونی نەزان. دەسەڵاتی سەرکوتکەر- بە هەموو شێوەکانیەوە (کۆمەڵایەتی، ئاینی، سیاسی) هێنرایە کایەوە بۆ پاراستنی لاوازەکان لەدەست زوڵمی بە هێزەکان (پارەدارەکان و خانەوادەکان و دەرەبەگەکان و دەسەڵاتە خۆسەپێنەکان). هەروەها (یاسا) دانرا بۆ پاراستن و چاودێری (ئازادی خەڵکی و ئاساییش و مافی ژیان بە سەربەستی و دوور لە زەبرو زەنگ). هەروەها یاساش دانراوە بۆ دانانی سنووری پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و دەزگا و دامەزرێنراوەکان. ئەمەیە ئامانجە

هاوبەشەکانی بیرمەندەکان (مفکرین) لە شارستانی میزۆپۆتامیای کۆن. هەروەها کۆنترین چاکسازی مرۆڤایەتی، کە پێمان گەییوە (چاکسازیەکانی ئۆرکاجینا) یە (٤٢ سەدە پێش زایین). کە لە (ئازادی= ئەمارجی) دەدوێ، لە پێناوی ئەوەدا هەژارەکان. بە خۆشی بژین لە پاڵ دەوڵەمەندەکان دا پێکەوە یاریدەی یەکتر بدەن لە کارو باری دنیایان، لە چوارچێوەیێکی پتەوی یەک گرتوودا بژین و بەڕێوە بچن و نەهێڵن، دوژمن وبێگاتە: ئەو یەک گرتنە پچڕ پچڕ بکات لە کاتی شاڵاو هێنانە سەریان.

بەڵام لە (داستانی گلگامێش) دا ئەو شانازییە بۆ بیرمەندەکانی شارستانی میزۆپۆتامیای کۆن، کە هەر چی بابەتی فەلسەفەی مرۆڤایەتی هەیە وەریان گرتووە و لێیان کۆڵیوەتەوە بە شێوازێک سازاندویانە لەگەڵ شارستانی بگونجێت و بۆمانیان بەجێهێشتوە بە دارڕژاوی. هەروەها لە نرخەکانی ڕەوشتیش دواون، بۆیە دەبینین سەرەتای ئەم داستانە نەمرە بە هەڵوێستێکی فەلسەفیانەی ڕوون دەست پێدەکات ولە ئاودانکاری وپەند دەدەێ وبە مرۆڤەکانی هەموو سەدەو چەرخەکان -٤٤- سەدە لەمەوبەر دەڵێ:

- ئەو هەموو شتێکی دیوە- گۆرانی بەیادی وڵاتەکەی گوتووە.
- ئەو هەموو شتێکی زانیوە و- سودی لە پەندو ئەزموونەکان وەرگرتووە.
- ئەوە داناو هۆشمەند بە هەموو شتێ...هتد. بۆ ئەوەی کۆتایی بهێنێ، بە نمایشەکانی و کوێرەوەرییەکانی مرۆڤ، و لەناوچوون (الفناء) و شەڕانگێری و بەرەنگاربوونەوەی کارە گران و قورسەکان، هەتا جاڕدانی ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

**یەکەم: سەرکەوتن بەسەر ترس و ڕاڕایی (تردد) و لاوازی و تاکپەرستی خراپ و بەدکار.**

**دووەم: گەشبین بە ژیان و دوارۆژەوە،** لە تەک ئەوەش دا مەرگ بەبەر چاومانەوە دێت و دەچێت، بەڵام بە مرۆڤ، دەگوترێ ئازابە و لە مەرگ مەترسە، ئەویشی بە کاری چاکەو یاریدەدان و ئاخاوتنی بە سوود و کاری باش و کردەوەی پەسەند و، دژ بە شەڕ و ناتەواوی

و زوڵم بوەستە و ڕەتیانبکەوە مەهێڵە لە دڵ ودەروونتا جێی خۆیان بکەنەوە، تۆ بەم کردەوانەت هەمیشە: تا هەتایە بە ئازایی و نەبەردی دەژیت، هەر وەک لە داستانەکەدا لەسەر زاری (گلگامش) ەوە هاتووە ئەو کەسە کەسێکی ئازا قارەمانە و ناوی لە نێو ناوە نەمرەکاندا تۆمار دەکرێ، بەمە داستانەکە کۆتایی بە گیروگرفتی چارەنووس دەهێنێ بە شێوەیەکی ئەرێنی (ایجابی). کە بە مرۆڤی ڕاگەیاندووە دەتوانێت بە نەمری بمێنێتەوە، ئەگەر خزمەتێکی باش پێشکەش بە کەسانێکی دیکە بکەیت. یادکردنەوەی چاکە لە سەرزاری خەڵکییەوە لە دوای مەرگی مرۆڤ و لەناوچوونی لاشەکەی، ناوی بە نەمری لە مێژوودا دەهێڵنەوە و نەوەکان یەک لە دوای یەک بە چاکە ناوی دەهێنن.

بەڵام بیرۆکەی (دادپەروەری) و تێکۆشانی مرۆڤ لە پێناویدا ئەوە بوو یاساکانی میزۆپۆتامیای کۆن ڕێکی خستووە، یاسای ئۆرنەمۆ (٢٢ سەدە پ.ز) دا ئەمەیان تۆمار کردووە، هەروەها(لەبت عەشتار) یش (لە سەدەی ٤٠ی پ.ز) دا بە پێی دەستوورەکەی خۆی تۆماری کردووە. هەتا دەگاتە سەر میلەکەی حامورابی (١٧٥٠ پ. ز) ئەم دەستوورە بە هۆی دادپەروەری دادوەران و قازی بە ویژدان و مرۆڤی هوشمەند بەدیهێناوە و بڵاوبۆتەوە کە. کۆمەڵگەی بەختیار ئامانجی خواوەندەکان و مرۆڤ بووە.

## ٢- بیروڕا فەلسەفی و زانستییەکان لە دۆڵی نیلدا:

پەیدابوونی شارستانی لە میسری کۆندا، دەگەڕێتەوە بۆ چوارەم هەزارەی پ.ز، لە بواری تەماشاکردنی گەردوون و زانیاری بیردۆزییانە، دەبینین پەیوەندی نێوان (خواو مرۆڤ) یان ڕێکخستووە و بیرۆکەی (یەکتاپەرستی)یان لەلا پەیدا بووە، وە باوەڕیان بە ژیانی پاش مردن هەبووە، کە تیایدا پاداشت و سزا نەک تەنیا بە پەیڕەوکردنی شێوەکارییە ئایینیەکانەوە بەندن، بەڵکو بە ڕەفتار و ڕەوشت پاکی ژیانیشەوە بەندن .

دروووستكردنی هەڕەمەكان و مۆمیاكردنی تەرمی مردوان ئەنجامی ئەو بیرۆكەیەن.

بەم شێوەیە میسرییە كۆنەكان بنچینەكانی باوەڕە دوانی یەكەی (گەردوون و مرۆڤ) یان دانا،و و ڕایان گەیاند خواكان یان یەك خوا بەرامبەر بە گەردوونی ماددی هەیە. لە شیش بەرامبەر بە دەروونی مرۆڤ . لێكدانەوەی ئەوتۆشیان بەشێوەی ئەفسانەیی بۆ دروست بوونی گەردوون داناوە.

ئاو(نون)یان بە نەژادی بونەوەرەكان (موجودات) داناوە. لەوەوەش خواكان پەیدابوون، كە هێزە سروشتییەكان وەك گەرمی و شێ دەردەبڕن. هەروەها یەكێ لەو ئەفسانانە باس لە خواوەندی (فتاح) دەكات، كە لە ڕێی وشەی (ببە)وە، شتەكان دروست دەبن، ئەم بیرۆكەیە، بیرۆكەی وشەی (كریستیانمان) بەبیردێنێتەوە، یان ئەو فەرمانەی خوامان دەهێنیتەوە یاد، كە ئەگەر شتێكی ویست لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت (ببە). ئەویش دەست بە جێ (دەبێت). (انما قلنا لشیء اذا اردنا ان نقول لە كن فیكون) (النحل-٤).

دانیشتوانی میسری كۆن ڕۆڵێكی شارستانی (بیری و زانستی) دیار و جیایان هەبووە ئەو سەرچاوانەی دەربارەی بیری میسرییە كۆنەكان و هەتا ئەمڕۆ پێمان گەیشتوون، وەك گەڵای بەڕەدی(بەردیات) و (كتێبی مردوەكان) و دەقەكانی هیرۆگلێفی ودەقی (مەنفیس) دەربارەی خەلیقەت، زانیاری زۆری دەربارەی گەردوون و بیری ڕەوشت گرتۆتە خۆی (تێدایە).

هەمووشیان لە دەوری یەك تەوەر (محور) دەسووڕێنەوە، ئەویش (گەردوون)ە لە كاریگەری ئەستێرەكان و هەسارەكان دەدوێ لە ژیانی مرۆڤدا بە تایبەتی (خۆر و مانگ). بە وردبوونەوە دەبینین لێكچوونێك (تشابە) هەیە لە نێوان هەندێ بۆچوون و لێكدانەوەی بیردۆزەیی سەبارەت بە گەردوون لە لای میسرییەكان و بۆچوون و لێكدانەوەكانی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا، سەبارەت بە نەژادی شتەكان، لە دەقی (شاری مەنفیس)

دا دەبینین: بیر و بۆچوونی بیرکەرەوە میسرییەکان لەو دەقانەدا هەوڵ دەدەن، شیتەڵکردنێکی فەلسەفی و لێکدانەوەیەکی هۆشیارانە بۆ نەژادی بوون و خەلیقەت بهێننەوە و بە (ئاو) و خوا (فتاح) و بەو وشەیەوە بیبەستنەوە، کە لەسەر ئاوی پیرۆزدا گوتراوە. هەرچی یان بوونەوەر هەیە بە بۆنەی هۆکارێکەوە هاتۆتە دی، ئەویش لە دایک بوونە (زاووزێ یە). کەواتە لە هەر بوونەوەرێک دوو هۆ هەیە ئەویش بوونی (نێر) و (مێ) یە. ئەگەر یەکیانگرت بە پێی ئەفسانە کۆنەکان و بیرورای بیرمەندەکان و دانایانی کۆن، بوون (وجود) دێتە کایەوە .

بیرمەندە کۆنەکانی میسری لایەنی ڕەوشتیان لە دەقەکانی (ژیانی دووەم) دا چارەسەرکردووە کە لە کتێبی (مردووەکان) دەبینرێ و هەرەشە لە خەڵکی دەکات و دەبێژێ: نەکەن کاری خراپە بکەن، چونکە هیچ کەسێ لەو دونیا، یان ژیانی دووەم لە دەست سزا رزگاری نابێت ئەگەر بێتو لەم دونیایەدا کارێکی خراپ بکات لەو دونیا حیساب و سزا چاوەڕێی دەکات.

بیرۆکەی مەرگ (فەنابوون) چارەسەری لە بیرۆکەی کۆنی میزۆپۆتامیا بە (نەمری مەعنەوی) بۆ دانراوە کە بۆ پیاوچاکان و خاوەن کردەوە باشەکان و کارە بەنرخەکان دێتەدی (بەچاک یادکرنەوەیان).

کەچی بیرۆکەی کۆنی میسری چارەسەری (مەرگ) ی داناوە بە بەرجەستەکردنی (نەمری ماددی) بە هۆی دوو دەستکەوتی زانستی مەزن کە یەکێکیان مۆمیاکردنی لاشەیە لە زانستی نۆشداری و ئەویتریان هەرەمەکانە لە زانستی ئەندازەیی و گەردوونناسی دا. هەرەمەکانیش بە تایبەتی بۆ (فیرعەونەکان) تەرخانکراوە، چونکە ئەو فیرعەونانە لە بیرۆکەی میسریدا بەرزبوون و گەیشتونەتە پلەی خواوەندە پیرۆزەکان، هەتا شا (ئەخناتوون= ئەمنوفسی چوارەم) مێردی (نیڤەرتیتی) بیری یەکتاپەرستی هێنایەکایەوە لەژێر کاریگەری ژنەکەی کەلە میتانیەکانی کوردستان بوو و بیرۆکەی خۆرپەرستی داهێنا، لەم بوارەدا بزووتنەوەی (ئەخناتوون) لە تەک مەرامەکانی ئیبراهیم خەلیل (خودا لێی رازی بێت) لە

یەکتاپەرستی دا یەک دەگرێتەوە کە بانگەوازی بۆپەرستنی تاکە خوایەکی گەورەو مەزن دەکرد لە وڵاتی بابل (میزۆپۆتامیا)، گەرچی هەردوو بانگەوازەکە لە میسر و میزۆپۆتامیا دا لەڕووی توێژینەوەوە جیاوازییەک هەیە لە نێوانیاندا.

### ٣- فەلسەفەی یۆنانی:

لە دواییەکانی سەدەی حەوتەم و سەرەتاکانی سەدەی شەشەمی پ.ز ئەم فەلسەفە یۆنانییە بۆ یەکەم جار لە کەنارەکانی خۆرئاوای ئاسیای بچووک (ئەیۆنیا) سەری هەڵدا لە دواییدا لە ئیتاڵیا و شارە کەنارییەکانی دوورگەی سقلیەو، لەدواییشدا لە ئەسینا لەسەدەی پێنجەمی (پ.ز) بڵاوبۆوە و لە سەدەی پێنجەم و چوارەم دا گەیشتە ئەوپەڕی گەشانەوە .

**لە گرنگترین هۆیەکانی دەرکەوتن و پەیدابوونی فەلسەفەی یۆنانی بە مەبەستی ژماردنییان نەک ڕاڤە کردنیان، ئەوانەن:**

١- پێشکەوتنە پێشووەکەی شارستانێتیەکانی میزۆپۆتامیا و میسری کۆن و فینیقییەکان و شارستانێتیەکانی دەریای ئیجە کەبە دەستیان هێنابوو.

٢- شوێنی جوگرافی وبازرگانی دوورگەی مەلّتیە لە ئاسیای بچوک بە شوێنێکی بازرگانی دادەنرێ لەگەڵ خۆرهەڵات دا، چونکە لە مەڵبەندەکانی ئەو شارستانێتیە کۆنانەوە نزیک بوو کە لە خاڵی یەکەم ناومان هێنان، ئەم دوورگەیەش، یەکێکە لەو دوازدە دوورگەیەی کە هەرێمی (ئەیۆنیا)یان پێک دەهێنا لە ئاسیای بچووک.

٣- باری ڕامیاری و هزری(بیری) یۆنان باش بووە چونکە ئاشتی و ئارامی تێیدا بەرقەرار بووە و ڕێککەوتنامەی ئاشتیشی لەگەڵ دراوسێیەکانیدا بەستبوو.

٤- ئازادی بیرکردنەوە بە تایبەتی لە ئەسینادا هەبووە، چونکە هیچ فەلسەفەیەکی ناوەندی نەبووە کەتێڕوانینێکی دیاریکراو بسەپێنێ

بەسەر بیرمەندەکاندا (مفکرین)،بەڵکو باوەڕەکانیان تەنیا هەرشتێکی ئاینی و نەریت بووە. لەسەر مرۆڤ هەر ئەوەبووە کە پێشبینیەکان بەدوای خۆی دەربارەی گەردوون و مرۆڤ دابڕێژێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەدەی شەشەمی (پ.ز) دەبینین چالاکییە بیری و هزرییەکانی ڕۆڵەکانی ئەو وڵاتانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی یۆنانیەکانەوە هەموویان لە دەوری (نەژادی گەردوون و بوون) دەخولانەوە. پرسیاری فەلسەفییان دەربارەی (ناوەڕۆکی) شاردراوەی پشت بوون دەکرد. لەم کارەیاندا بەهەر ڕەنگ و شێوەیەک بێت پابەند بوون بە وەڵامە فەلسەفییەکانی میسرو میزۆپۆتامیا. لەپاڵ ئەوەدا کە سوودیان لە دەستکەوتە زانستییە جیاجیاکان وەردەگرت، وەک نۆشداری و بیرکاری و گەردووونناسی و فیزیا ودەریاوانی (الملاحة) دەورێکی گرنگی هەبووە بۆیەکەوە بەستنی ڕاستەوخۆی دانیشتوانی دوورگەکانی یۆنان و کەنارەکانی باکووری دەریای سپی ناوەراست بە دانیشتوانی کەنارەکانی شام و باکووری ئەفریقیا، لەڕووی شارستانی سەربازییەوە، سەرەرای ئەمانەش دەبینین زانستخوازان و لایەنگرانی زانیاری لە بیانیەکان ڕوویان دەکردە مەڵبەندەکانی شارستانی لە دۆڵی نیل، بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری و گەڕانەوە بۆ وڵاتە دواکەوتووەکانیان بۆ بڵاو کردنەوەی شارستانێتی.

دەتوانین وەڵامەکان و شیکردنەوەکانی فەلسەفەی یۆنانی بە پێی پەرەسەندنی قۆناغەکانی مێژوو بۆ سێ قۆناغ دابەش بکەین:

**هەنگاوی یەکەم:**

**فەلسەفەی یۆنان هەتا سوکرات:**

**ئـ- فەیلەسوفەکان لێکۆڵینەوە لە جیهانی دەرەوە دەکەن:**

پرسیارە گەورەکە لێرەدا بریتییە لەوەی ئایا ڕەچەڵەکی شتەکان چییە؟ ئایا گۆڕان و زۆری هەیە؟ لەسەر ئەوبنچینەیە دەتوانرێت خوێندنگە زۆرەکان تا هاتنی سۆفستاییەکان دیاری بکرێن .خوێندنگەکان ئەمانەن:

خوێندنگەی ئایۆنیا، خوێندنگەی ئیلی، خوێندنگەی زۆری، خوێندنگەی فیساگۆرسی، خوێندنگەی گەردیلەیی.

هەرچی (خوێندنگەی ئایۆنیا)یە کە بە ناوی ئایۆنیای ئاسیای بچووکە، فەیلەسووفەکانی وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوەیان داوەتەوە و هەوڵیان داوە بە شێوەیەکی فەلسەفی وزانستی وەڵامی بدەنەوە، کە ڕەچەڵەکی شتەکان یەک توخمە، یان یەک شتە کە یەکەم کەرەستەی هەموو شتێکە. ئەم توخمەش یان ئاوە، یان تێکەڵێکی یەکسانە لە هەموو شتێک، یان هەوایە، یان ئاگرە. لەگەڵ ئەوەی کە ڕەچەڵەکی شتەکانی بە یەک لەو توخمانە داناوە، لەهەمان کاتدا دانیان بە هەمە جۆری و زۆری و گۆڕانی شتەکان ناوە.

هەرچی (خوێندنگەی ئیلی) ئەوا بەرپەرچی ئەم بۆچونەی داوەتەوە بەوەی کە چۆن شتەکان هەمەجۆر و زۆرن، و گۆڕانیان تێ دەکەوێت، ئەگەر ڕەچەڵەک و پێکهاتنیان یەک توخم بێت؟

شیکارەکە دەبێت یەک لەم چارەسەرە بێت:

چارەسەری یەکەم بریتیەلە نکوڵی کردن لە هەموو گۆڕان و هەمەجۆری و زۆری،وەدەبێ بڵێین یەک ڕەچەڵەک و یەک بوون هەیە، کە ئەمە ڕای فەیلەسووفانی (ئیلیا) ی خوارووی ئیتاڵیا بووە و لەسەر بنچینەی وتەی ئەوان (خوێندنگەی ئیلی) پێکهات کە دانی بە هیچ زۆری و گۆڕانێک نەدەناو دەیووت کە ئەمە لەکرداری زانیاری هەستی تەواو و ڕواڵەتی خەڵەتێنە، بەڵام زانیاری تەواو کە ژیری دەیگاتێ ئەوەیە کە بوون یەکە چ کورسی بێت یان درەخت. بوون سیفەتی گەوهەری شتەکانە، جیاوازی نێوان شتەکانیش جیاوازی لاوەکین، ئەم دوو خوێندنگەیەی سەرەوە، (خوێندنگەی یەکبوون)یان پێ دەووترێت.

چارەسەری دووەم بۆ بەرپەرچدانەوەکەی پێشوو:بریتیە لە قبوڵ کردنی زۆری و گۆران و، ڕەچەڵەکی شتەکان یەک نییە،بەڵکو چەند ڕەچەڵەک و توخمێکە.

لێرەدا (خوێندنگەی زۆری) پەیدا بوو، کە یەک لە فەیلەسوفەکانی

ئەم چوار توخمەی بە رەچەڵەکی شتەکان داناوە(ئاو و هەواو ئاگر و گڵ): فەیلەسوفێکی دیکە وتوویەتی (تۆ) یان (گەردیلە) ی ئێجگار ورد رەچەڵەکی شتەکانن کە لە هەر پشکێکیان چەند بچووک بن، ڕێژەیەکی هەموو شتێک لە موو وخوێن و گۆشت و هتد...ی تێداهەیە، لە هەردوو بارەکەشدا شتەکان لە چوار توخم پێکهاتبن یان لە گەردیلە، لە بەشی جیاوازی ئەو رەچەڵەکە پێکهاتوون (لەو توخمانە یان لەو گەردیلانە). تایبەتیەکانی هەر یەک لەو توخمانە یان گەردیلانە ئەوەیە کە بە چەسپاوی دەمێننەوە، توشی گۆڕان یان هەڵچوون نابن، بەڵکو ئەوەی دەبێت ئەو توخمانە یان ئەو گەردیلانە تێکەڵ دەبن، ئەو لەشەی پێکی دەهێنن (ئاوێتە) نییە، بەڵکو تێکەڵەیە لە ڕێی (گردبوونەوەو جیابونەوە)، واتا شتێکی نوێ دروست نابێت، بەڵکو تەنیا هاتنە پاڵ یەک و گردبوونەوەیە، وەک چۆن لە دەنکە گەنم و جۆ و نیسک بە یەکەوە کۆدەکەینەوە هەروەک قوتابخانەی گەردیلەیی وای بۆدەچێ.

(خوێندنگەی فیساگۆرسی) ش خوێندنگەیەکی گەردیلەیی بووە لەگەڵ ئەوەشەوە کە (ژمارەی) بە رەچەڵەکی یان سەرەتای هەموو بونەوەران داناوە. ژمارە بە لایانەوە شێوەی ئەندازیاری وەردەگرێت، بۆ نموونە ژمارە (٣) بە سێگۆشە یەکسانە، لەبەر ئەمە بە ڕای ئەوان هیچ شتێک نییە لە ژمارە پێک نەهاتبێت، واتە بە شێوەی ژمارە نەبێت، واتە شێوەی ئەندازیاری هەیە. بێجگە لەمە دانیان بە چوار توخمەکە ناوە کە رەچەڵەکی شتەکانە، واتە باوەڕیان بە پێکهاتنە ماددیەکەی شتەکان هەیە، بەڵام وایان داناوە کە شتەکان شێوەو شوێن وەردەگرن، شێوەیەکی ئەندازیاری وەک گۆ(تۆپی پێ) یان خشتەک و بەو شێوە. هەروەک (فیساگۆرسی) وادەڵێن کە لە خوارووی ئیتاڵیا پاش مردنی فیساگۆرس پێکهات. فیساگۆرسی کە ڕێکخراوێکی ڕامیاری وئایینی و فەلسەفی بووە، دژایەتی دیموکراسی ئەسینای کردووە. فیساگۆرس دەڵێت دەروون ماددە نییە و نەمرە و گیانەکان لەرێگەی گیانگۆڕکێ (التناسخ) دەگوازرێنەوە،هەرئەویش بوو واتای خۆشەویستی بۆ دانایی فەلسەفەی دانا.

(خوێندنگەی گەردیلەیی)کە دیموکریتس دامەزرێنەری بووە،یەک لێکدانەوەیی وچەند لێکدانەوەیی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە،رەچەڵەکی هەموو شتەکان بەلای ئەو خوێندنگەیە گەردیلەن وپەرت نابن،ئەو گەردیلانە یەک شێوەن بەسروشت وپێکهاتنیان یان بە بنچینەی دامەزاندنی مادديان،بەڵام بەشێوە جیاوازن (وەک دوو پیتی B.A) وەبەڕیز وەک (AB.BA)وبەدانان وەک (H،I)،ئیتر لەو جیاوازیانەو لەژمارەی پێکهێنەری تەن(لەش) شتەکان و ئەوەی هەیە جیاوازدەبن. هەموو شتێکیش تەنانەت ژیان ودەروونیش لە گەردیلە پێکهاتوون و گەردیلەش هەمووی پڕن (هیچ بۆشایی لەناویاندا نییە)،هەرچەندە لەبۆشایی دا دەجولێنەوە،گردبونەوەی گەردیلەکان بۆشایی تێدەکەوێ بەمەش تەنەکان(لەشەکان) لەکەلێن و چڕییان وقورساییان جیاوازدەبن.جوڵەی هەتاهەتایی،گەردیلە هەتاهەتاییەکان هەڵدەدات و بەیەکدا دەچن و لەگەڵ بۆشایی دا تەنی بچوک گەورە پێک دێنن،گەردیلە خۆی بە تەنها رەنگ وچێژ وبۆن و قورسایی نییە بەڵام ئەمانە گشتی پێکدێن بە کۆبونەوەیان لە تەنێکدا،وەبە هەستەکانمان هەستیان پێدەکەین،ڕاستی شتەکان ڕاستی تەنەکان نین کەلە گەردیلە پێکهاتوون،کەئەمەش یەکەم خاڵی جیای سیفەتە سەرەکیەکانی شتەکان(سیفەتە تاکەکانی گەردیلەکان) و سیفەتە ناسەرەکیەکانی بارگەو تەنەکانە.

## ب- فەیلەسوفەکان ڕوویان کردە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ:

سۆفستاییەکان لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی پێش زایین پەیدابوون. وایان لە فەلسەفە کرد ڕوو بکاتە بایەخدان بە مرۆڤ لە جیاتی گەردوون. واتە لە لێکۆڵینەوەی گەردوونەوە بۆ لێکۆڵینەوەی مرۆڤ. ئەمە بە هۆی ئەوەوە بووە کە ئەسینا بەسەر ئەیۆنیاو هەندێ دوورگەی دەریای ئیجە زاڵ بوو و بەسەر فارسەکاندا سەرکەوت و (پێرکلێس) دەستوورێکی دیموکراسی بۆ دانا.

کە پێویستی لێدوانی ڕامیاری و یاسایی و هەڵبژاردن زیادی کرد لەگەڵیدا پێویستی مامۆستا بۆ ووتار بۆئەوەی کارلە کۆمەڵگە بکات

پەیدابوو. بەو شێوەیە مامۆستایان پەیدابوون و واتای (سۆفستایی) لە سەرەتادا هەر ئەمەی دەگەیاند واتا مامۆستایانی دانا(حەکیم) بەرامبەر بەکرێیەکی کەم، ئەمانە زێدەڕۆییان لە دووپاتکردنەوەی ڕێژەیی هەر زانیارییەک و هەر ڕاستییەک دەکرد. دەیان وت ڕاستی وچەوتی و چاکە و خراپە گشتی نین، بەڵکو چاکەو خراپە ئەوەیە کە تاکەکەس دەیبینێت. ئەمە واتای وتەکەی (پرۆتاگۆراس) ی دامەزرێنەری خوێندنگەکەیە: (مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە).




**سۆکرات:** سۆکرات کە لە ساڵی (٣٣٩ پ.ز) دەرکەوت لەگەڵ ئاراستەکانی سۆفستاییەکان نەیار بوو، هەر چەندە وەک ئەوان لە فەلسەفەی سروشتی و لێکۆڵینەوەی گەردوون دوورکەوتبووە و فەلسەفەی لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ هێشتبۆوەو دەیووت (ئەی مرۆڤ خۆت بناسە). لە چاکە دەدواو لەگەڵ زانیاری جووتی دەکرد. بە لای ئەوەوە ئەوەی بزانێت چاک دەبێت، ئەمەشە واتای وتەکەی (چاکە زانینە) بایەخی بە دیاریکردنی واتای وشەو چەمک داوە، واتا دانانی پێناسەی جێگیر بۆ شتەکان. بەم شێوەیە توانی بەرپەرچی سۆفستاییەکان بداتەوە کە یاریان بە وشە دەکرد. بە تاوانی تێکدانی لاوان و نکوڵی کردن لە خواکانی شار و باوەڕهێنان بە خوای تر بڕیاری کوشتنی درا. بە بڕیاری دادگە لە بەندیخانەدا ژەهری خواردەوە. باوەڕی وابووە کە دەروون پاش مردن دەمێنێتەوە. زۆر خوێندنگەی سەر بە فەلسەفەکەی ئەو پەیدا بوون و یەکێ لە قوتابیە هەرە گەورەو گرنگەکانی ئەفلاتوون بوو سۆکرات هیچ کتێبێکی لە دوا بەجێ نەماوە، بەڵام وردبینی لە( هونەری کۆڵین) دا کرد بەهۆی وتوێژە فەلسەفیەکانی دەربارەی مرۆڤ و سروشتی مرۆڤ و بنج و بناوانی زانیاری و کۆڵەکەکانی زانیاری. سۆکرات لە ژیانی خۆیدا،

بەرەنگاری ئەو ئاڵۆزییە بۆوە، کە سۆفستاییەکان بەسەر بیر و هۆشی لاوەکان سەپاندبوویان، واتە هۆشیان پێ چەواشە کردبوون.

ئەم فەیلەسووفە دوای دانایی کەوتبوو، هەمیشەو بە بەردەوامی لە تەک خۆیدا دەیگوتەوە، ئەم داناییەش ئەمەیە (ئەی مرۆڤ خۆت بناسە) هەتا بتوانێت ئەم دەستەواژەیەی کە لە کاهینەکان رۆژێ لە رۆژان بیستبووی کەپێیان ووتبوو: (ئەی سۆکرات تۆ لە نێوان هەموو ئەسینییەکان داناتر و بە دادتری)لەسەری بڕوات. (سۆکرات) زۆر بە جەرگانە بەرەنگاری بیروباوەڕی سۆفستاییەکان بۆوە، چونکە ئەو بیروباوەڕە ئاڵۆزو سەرلێشێوێن بوو، هەرچی سۆکرات بوو، باوەڕی بە پێغەمبەرێتی هەبوو، باوەڕی بە هەواداری ڕەوشتی و ئایینی هەبوو، باوەڕی بە ژیانەوەی جاری دووەم و بوونی دادپەروەری و ڕاستی هەبوو، هەرچەندە سۆفستاییەکان نکوڵییان لێ دەکرد . لە پێناوی ڕاستی و ڕاستیکاریدا، ملکەچ نەبوو و سووربووە لەسەر بیر و باوەرەکەی. بۆیە نەیارەکانی لەنێو دەسەڵاتی حکومەتی یۆناندا، بە گرتنیان داو تاوانێکی گەورەیان خستە پاڵ و دادگە حوکمی مردنی بەسەردا سەپاند و، بە ژەهر کوشتیان، خۆشی نەیویست لە بەندیخانە ڕابکات. قوتابییەکەی (ئەفلاتون) زۆر بە شانازی و جوانیی و ڕێکوپێکیەوە ناوی بە (نەمری گیان) تۆمار کردو، هەرچی بیر و بۆچوونەکانی سۆکرات هەبوو دەربارەی ژیانی دووەم و دادپەروەری خوا هەمووی تێدا خستە ڕوو.

سۆکرات لە ساڵی ٣٣٩ پ.ز بە ژەهر دەرمان خواردکراو بۆ یەکجاری سەری نایەوە دوای ئەوەی هەرچی کۆڵەگەکانی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی و زانستی و ڕەوشتی هەیە هەمووی دامەزراند، قوتابییەکەی ئەفلاتون، دوای ئەویش ئەرستۆ گەشەیان پێدا و نەیان هێشت بیروڕایەکانی بفەوتێن.

**هەنگاوی دووەم**

**قۆناغی بوژانەوەی فەلسەفەی یۆنانی (گەردوونی و ڕەوشتی)**

**ئەفلاتون و ئەرستۆ:**

بە لە سێدارەدانی سۆکرات، فەلسەفە تووشی نەهامەتییەکی گەورە هات، چونکە بیر و ڕێبازەکانی سۆکرات لە لایەن قوتابییە زیرەکەکانیەوە لەوانەی بە دوای زانست و فەلسەفەدا دەگەڕان، زۆر سوودیان لەو دەسکەوتانەی سۆکرات وەرگرت تا کار گەیشتە ئەوەی کە لەسەر دەستی ئەوان لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ڕاددەی کامڵبوون لەسەر هەردوو ئاستی گەردوونی و ڕەوشتی (واتا لەسەر دەستی ئەفلاتون و ئەرستۆ).

**١- ئەفلاتون (٣٤٧پ.ز)**




ئەفلاتون فەیلەسوفێکی ئەسینایییە، کتێبی (کۆمار) و (یاساکان) و (وتوێژەکان) ی داناوە، لە دوای ئەوەی سەرسام بووە بە فەلسەفەی سۆکراتەوە. وتووێژی دژ بە سۆفستاییەکان تۆمار کردووە، بە لە سێدارەدانی سۆکرات زۆر دڵگران و پەست بووە.



هەوڵی داوە چاکسازی (کۆمەڵایەتی- ڕەوشتی- فەلسەفی) جێبەجێ بکرێ، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە چارەسەرەکانی لەم



بوارەدا ڕاستەقینە (واقعی) نەبوون و خەیاڵی بوون، بۆیە ئەفلاتون بە (نموویی- مثالی) ناسرا:

أ- ئەفلاتون لە فەلسەفەکەیدا، پشتی بە دوو بەرنامە (سەرکەوتن) و (دابەزین) بەستووە لە پێکهێنانی زانیاری دەربارەی گەردوونی و ڕەوشتی.

دەبینین لە بەرنامەی (سەرکەوتن)دا پشت بە تێبینی و هەڵێنجان دەبەستێ، بۆ ئەوەی لە گەردیلە بینراوو هەستپێکراوەکانەوە بچێت بۆ

واتای گشتگیر و سەرتاپاگیر یاخود لە کاروان وپیرۆت وشاسوار ... هتد وەک لە تاکەکەسێ بچێت بۆ (مرۆڤایەتی). بەڵام لە بەرنامەی (دابەزین) دا ئەفلاتون بەڵگەکاری بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لە زانیارییەوە لە واتای گشتگیری و سەرتاپاگیریەوە، واتە لە (مرۆڤایەتی)یەوە بچێت بۆ گەردیلە هەست پێکراوەکان (تاکەکەسەکان) لە کاروان و پیرۆت و شاسوار و هتد.

ب- ئەم فەیلەسووفە، فەلسەفە گەردوونییەکەی لەسەر بنچینەی بیرۆکەی نموونەیی (مثالی) دامەزراندوە، شتەکان لەلای ئەو سێ شتن: (خوا) ی مەزن هەیە کە ناوی ناوە (ئەندازیاری مەزن). دووەمیان (بەها نەگۆڕ و ڕەهاکان) کەبوونیان هەیە لە جیهانی ئاسماندا (کە نموونەی تەواو و بەرزن بۆ هەموو شتێکی خولقێندراو)، سێیەمیشیان (سروشتی شێواو) کە پێویستی بە یاساو ئەندازە هەیە.

(ئەندازیاری مەزن) سروشتی شێواوی ڕێکخستووە و یاسای نموونەیی و جوانی تێدا داناوە، ناوەرۆکەکانی زەوی ووێنەی نموونەیی و هاوشێوەکانی لە خۆگرتووە. هەر وەک بوونی (گیان) لە جەستەدا. گیان (وێنەیەکی نموونەیی) ئاسمانییە خراوەتە جەستەی سروشتی زەوییەوە، بۆیە گیان تێدەکۆشێ بۆ جیابوونەوە لە لەش و گەڕانەوە بۆ ئاسمان لە ڕێی مردنەوە، یان گیانگۆڕکێ (دۆنا دۆن) (تناسخ الارواح).

پ- ئەفلاتون قوتابخانەیەکی بۆ فەلسەفە دامەزراندو ناوی نا (ئەکادیمییە) و لەسەر دەروازەکەی نووسی (تەنیا ئەو کەسانە بێنە ژوورەوە، کە ئەندازە دەزانن)، چونکە لە توێژینەوەی فەلسەفی و ڕێکخستنی بیر و هزرەکان و تێڕوانین گرنگی بە ئەندازە و بیرکاری دەدا، هەوڵی دەدا کە کۆمەڵگەیەگ بێنیتە کایەوە کە فەیلەسووفەکان بیبەن بەڕێوە، هیچ خراپی و ئازاری تێدا بەدی نەکرێ، وەک ئەوەی کە لە کۆمەڵگەی ئەسینیدا دەیبینی. لەبەر ئەوە ئەم فەیلەسوفە زانینی تەواوی شتەکان، وناوەڕۆک و چییەتی و نموونە ژیرییەکانی کرد بە بابەتەکانی زانینی یەقینی ڕاست ودروست، لەمەدا شوێن پێی مامۆستاکەی کەوت، چونکە هەربەتەنها پشتی بە هەستکردن و گومان و دیاردە ئاڵوگۆڕکراوەکان

نەدەبەست،بیرکاریشی بە نموونەیەک دانا بۆ بۆچوونەکانی بیری بەرز کە هیچ گومانێ ناگرێتە خۆی.

ج- ئەفلاتون باوەری بە نەمری گیان وگەڕانەوەی بۆ جیهانی ئاسمان هەبوو، هەروەها بڕوای بە (گیانگۆڕکێ- تناسخ الارواح) هەبوو، کە لە زیاتر لە یەک جەستەی هاوبەشدا دەگیرسێتەوە، لە هەموو بوونەوەرە زیندووەکاندا.

مرۆڤ بە بۆچوونی ئەفلاتون، ئەو دروستکراوەیە (مەخلوقەیە)، کە گەورەیی ئەندازیاری مەزنی تێدا بەدی دەکرێ، دەروونی لە تەک جەستەیدا کۆ دەبێتەوە، وە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا سێ دەروون هەیە ( شەهوائی) و (توڕەیی) و(ژیریێتی)، ژیرەکان ئەوانەن کە دەروونە ژیرەکەیان زاڵە بەسەر دەروونە توڕەکەیان (لە دڵ دا) وبەسەر دەروونە شەهوائیەکەیان(لەگەدەوهەناودا)، بەمەش چاکە و پەسندی بۆخۆی ڕادەکێشێ، هەست بە ڕاستییەکانی پڕ لە خێر و بەرەکەتی مەزن دەکات. ئەمە ئەو بەختیارییەیە، کە کەس هەستی پێ ناکات، جگە لەوانەی (فەلسەفەی میتافیزیکی) دەزانن ( کە بە چوار دەوری جیهانی ئەو دیو سروشتدا، دەسوڕێتەوە). زانینی ڕاست و ڕەوا ئەو زانیارییەیە، کە بابەتەکانی خوا و دنیای نموونەیی و ئاسمان و چاکەکانن...

ئەمەش ئەو ئەو ئامانجەیە، کە دڵا و دەروونی مرۆڤ بە دوایدا، دەگەڕێ لە ڕێڕەوی پاکژکاریدا، هەتا گەڕانەوی بەرزو پەسەند بۆ جیهانی هەوا، بەدەست دەهێنی. هەروەها بۆ جیهانی نموونەیی.




**٢- ئەرستۆ (٣٢٢ پ.ز):**

ئەرستۆ فەیلەسوفێکی مەکدۆنیا(مەقدۆنیا) ییە. فەلسەفەی لە (ئەکادیمییەی ئەفلاتون) خوێندووە، هەمیشە لە هاوڕێکانی سەرکەوتووتر بووە. زیرەکی خۆی پیشانداوە

له میانەی لێکۆڵینەوە لە فەلسەفەو ڕەخنەگرتن لە بیردۆزەکەی(ئەفلاتون) ی مامۆستای لە بارەی(نموونەیی) . باوەڕی بە لێکدانەوەی خۆرهەڵاتی لەبارەی گەردوونەوە واتە بە (زیندەگی هەسارەکان) هەبووە،کە لای دانیشتوانی کۆنی میزۆپۆتامیا ودۆڵی نیل هەبوو. توێژینەوەی فەلسەفە گەیاندۆتە لوتکە. ئەم و فێرکارەکانی پێیان دەگوترا (ڕۆیشتیارەکان= المشائین)، چونکە کاتێک وانەی فەلسەفەی لە قوتابخانە نوێیەکەی دەگوتەوە لە باخێکدا کەلە دوای مەرگی مامۆستاکەی کردی بە مەڵبەندی فەلسەفە وووتنەوە، بە پێ وانەکەی دەووتەوە بۆخوێندکارەکانی لەناو باخەکەدا. ئەرستۆ-مامۆستای ئەسکەندەری مەکدۆنیش بووە لە کۆشکی شاهانیدا بۆ ماوەی چەند ساڵێک ئەرستۆ بە (مامۆستای یەکەم) ناوبراوە، لەبەر دانانی چەندان دانراوی دەربارەی فەلسەفەی جۆراو جۆر، بە تایبەتی لە مەیدانی لۆژیک و بەرنامە وباسی توێژینەوە، هەروەک چۆن موسوڵمانەکان دواتر (فارابی)یان ناونا بە مامۆستای دووەم.

**١- بەرنامەکەی:**

ئەرستۆ بە بەرنامەیەکی زانستی ناوی دەرکردبوو، ئەم بەرنامەیەش پشتی بە تێبینی و دەستنیشانکردنی کێشەکە و بارودۆخەکەی و بۆچوونی کەسانی پێشووتر دەبەست لە بارەی کێشەکە تادەگەیشتە ئەوەی چارەسەرێکی گونجاوی بۆ دابنێ. ئەرستۆ بەرنامەی بیرکاری-لۆژیکی لە باسە جیاجیاکانیدا. بەکاردەهێنا، بۆ ئەوە تێدەکۆشا هەتا (زانستێکی بەڵگەدار واتە: بەڵگە نەویست) دابمەزرێنی، کە پشت بە زانیاری و بیروباوەڕ سەرەتاییەکان ببەستێ لە یاساکانی هۆکاری (السببیة) لە زانستی سروشتیدا.

**٢- فەلسەفەکەی:**

فەلسەفەکەی ئەرستۆ فەلسەفەیەکی سروشتیانە بووە کە بابەتەکانی (هەستپێکراو و جووڵێنەر) ی بوونەوەرەکانی دامەزراندووە لەسەر بناغەیەکی پتەوی پشت بەستوو بە زانین و هۆکار و ئەنجام، تادەگەیشتە هۆکاری یەکەم لە جولانەوە دا، ئەویش پاش ئەوەی کە

بۆی دەرکەوت شتەکان لە جیهانی سروشتیدا لەسەر چوار هۆکار دامەزراون: (ئەو کورسیەی کە لەسەری دادەنیشین بۆی بە نموونە وەردەگرین):

**یەکەم**: هۆکاری کردەیی: کە هۆی دروستکەری کورسیەکە (هۆی نزیک) (دارتاشەکەیە).

**دووەم**: هۆکاری کەرەستەیی (ماددی): کە هۆی کەرەستەکەی کورسیەکە دەنوێنێ (دارەکەیە).

**سێیەم**: هۆکاری شێوەکی: کە شێوازی ئەندازەیی کورسیەکە بە چ شێوەیەکی ئەندازەیی و هونەری دروستکراوە،دەنوێنێ.

**چوارەم**: هۆکاری نادیار: کە مەبەست لە دروستکردنی کورسیەکەیە (دانیشتن).

ئەم هەموو هۆکارانە بە پێی چەند یاسایەکی هەمەجۆر لەسەر (ئاستی بوونی سرووشتی) گۆڕاو کار لە یەکتری دەکەن لە نێو جوڵەیەکی بەردەوام لە (پەیدا بوون و لەناو چوون) و گۆڕاندا.

فەلسەفەی میتافیزیکی (ئەودیو سروشت) بابەتەکەی لای ئەرستۆ بوونە بە ڕەهایی (الوجود بالاطلاق) بۆیە لەسەر بناغەی زانیاری (هۆکاری یەکەم) (خوای گەورە) دامەزراوە، بەو وەسفەی کە هۆی جوڵانەوەی هەموو شتەکانە بەبێ ئەوەی خۆی بجوولێ. ئەرستۆ بابەتی ئەودیو سروشت (میتافیزیکیا) ی بە گرنگترین بابەتەکانی فەلسەفە دەژمارد چونکە لەدەوری زانینی هەموو زانیارییە ژیریی وبیروباوەڕە سەرەکییەکان و ڕێوشوێنە باڵاکانی شتە پایەدارەپاکەکانی جیهانی ئاسمان دەسوڕێتەوە،لەوەی کە هۆشی ئەستێرە کارلەیەک کەرەکانی جیهانی سەر زەمینن.

بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی فەلسەفەکەی ئەرستۆ بە ڕەوشتەوە: ئەوا بابەتەکانی (وەک مرۆڤ و خێر و خۆشی و کرداری چاک) ی لەسەر بنەمای تێڕوانینێکی پەروەردەیی دامەزراندووە.

تیایدا مرۆڤ وەک لاپەڕەیەکی سپی لە سەرەتای بوونیەوە بەدی دەکرێت پاشان زانیاری وپێگەیاندنە ناڕەواکەی لە ژینگەو دەوروبەرەکەی

وەردەگرێ، بۆیەش بایەخێکی گرنگی بە پەروەردەکردن داوە بەوەی کە ڕەگی خووڕەوشتی چاک و زانیاری ڕاست و ڕەوان دادەکوتێ. بناغەی بەختەوەریش لە لای ئەرستۆ هەستکردنە بە کاری فێرکردنی هەر کەسێک تا دەگاتە ڕادەی هەستکردن، وزانینی چاکەیە لە خودی خۆت(لەلایەن هەرکەسێک) تادەگاتە ڕاددەی هەستکردن بە بەهاکانی جوانی و چاکە کە ئەمەشیان بەڕاستی مایەی شادی مرۆڤە. چاکە لای ئەرستۆ (ناوەندێکی زێڕینە) (الوسط الذهبي) بە پێی ئەوە مرۆڤ خۆی لە توندڕەوی و لەڕێ لادان ( التطرف والانحراف) سەبارەت بە ڕەفتاریەوە دوورەپەرێز دەگرێت. پیاوچاکیش ئەو کەسەیە کە (زێدە) و (زێدەڕۆیی) (الافراط والتفريط) لە هەڵوێستەکانی ڕەوشتیدا بە هۆی هەستکردنی بە (ناوەندی زێڕین) ی هاوسەنگ ناکات، ئەمەشیان لە زاڵبوونی (هێزە هۆشمەندەکان) (القوى العاقلة) بەسەر هێزەکانی نێو ناخی مرۆڤ وەک (تووڕەبوون و شەهوەت) ( الغضب و الشهوة) دێتە کایەوە.

بۆ نموونە ئازایەتی ناوندێکە لە نێوان (ترسنۆکایەتی و ملهوڕیەتی) (الجبن والتهور)، کەچی دادوەری گونجاندن وهاوشێوەکردنە لە نێوان ڕەفتاری مرۆڤ ویاسای ڕەوشتی.لێرەدا ئەرستۆ سەبارەت بە فەلسەفەکەی ڕەوشت و ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکەی باسی خێزان و پەروەردە و کۆمەڵ و ڕێکخراوان و ڕێسا گشتیەکان دەکات.

لە دواییدا دەمارگیریەکەی بۆ ئەسینا ئەوەندەی نەمابوو پاش سۆکرات پەکیش بەفەلسەفەکەی ئەرستۆ بخات، کاتێ کە دووچاری پیلانەکانی هاوچەشنی پیلانەکانی پێشوو بۆوە بەوەی کە (ئەرستۆ بێگانەیەو خەڵکی ئەسینا نییە) ئەرستۆش هەر بە شەو ئەسینای جێ هێشت و دەیگوت: (نامەوێ جارێکی دیکە خەڵکی ئەسینا زەفەر بە فەلسەفە ببەن).

لەساڵی ٣٢٢ پ.ز ئەرستۆ کۆچی دواییکرد پاش ئەوەی سوپای خوێندکارەکەی خۆی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) شاڵاوی بەرەو جیهانی خۆرهەڵات برد تا گەیشتە چین، وساڵی ٣٢٣ پ.ز لە بابل دەمرێ ولەناوچەی ئەسکەندەریەی نزیک بابل دەنێژرێ.

ئەسکەندەری مەکدۆنی شاری (بابل) ی کرد بە پایتەختی شانشینەکەی لە خۆرهەڵات لەبەر مێژووە مەزنەکەی و شارستانێتی و ئاوەدانیە سەرنج ڕاکێشیەکەی.

### قۆناغی سێیەم:

فەلسەفەی یۆنانی پاش ئەرستۆ(گومانکاران، ئەپیکۆرسییەکان، هەیوانییەکان، قوتابخانەکەی ئەسکەندەریە):

#### ١- گومانکاران: ( الشکاک)

ئەم ڕێبازە لە سەدەی چوارەم و سێیەمی پێش زایین بڵاو بۆوەو تا سەدەی یەکەم ودووەمی زاینی درێژەی هەبووە.

تیایدا دەیانگوت بڕیار و هاودژیەکەی یەکسانن بەم پێیە مەحاڵە بڕیار لەسەر شتەکان بەتەواوەتی بدرێت، بۆنمونە دەڵێن بە هەست دەزانم کە هەنگوین شیرینەو ئاگر سوتێنەرە، بەڵام دەبێ بڕیار لەسەر ئەوە نەدەم کە هەنگوین شیرینە و ئاگر سوتێنەرە،بەم چەشنە لەم بڕیارلەسەر نەدانە هێمنی و شادی و بەختەوەریمان دەست دەکەوێ، کە ئەمەش مەبەستی فەیلەسووفن، ڕاستییەکانیش چەسپاویان بۆنییە و یەکبوونیش لە زانین دا نییە.

#### ٢-ئەپیکۆرسییەکان (الابیقوریة):

ڕێبازی گەردیلەیی یۆنانی پێشوو لەسەر دەستی (ئەپیکۆرس) گەشەی سەند، دوای ئەوەی قوتابخانەیەکی لە ئەسینا بە ناوی (باخچەی ئەپیکۆرس) دامەزراند. بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی(دیمۆکریتس) ئەمە وای بۆدەچوو گەردیلەکان قورساییەکیان هەیە لە سروشت دا ویەک نیین، بەمەشیان جیاوازی نێوان بوونەوەرەکانی لێک دەدایەوە وباوەڕی بە هەبوونی سروشتی هەبووە، بەڵام هەوڵی ئەوەشی داوە کە سەربەستی مرۆڤ بە شێوەیەکی گەردیلەیی لێک بداتەوە بەو واتەیەی کە گەردیلەکان لە بۆشایی دوای ئەوەی کەدەکەونە خوارەوە لە خۆیانەوە دەتوانن لابدەن یان بچەمێننەوە. بەم تێڕوانینە ساکارانە ئەوە دەسەلمێنن

که لادانی گەردیلەکان مەرجێکی گرنگەو یەکگرتنی گەردیلەکان شتێکی کاتییە و داوای تام وچێژی هەمیشەیی واتە ژییرییەتی دەکەن. لە بارەی رەوشتەوەش دووپاتی ئەوەیان دەکردەوە کە تام وچێژی هەست کردن داواکاری ئەو مرۆڤەیە کە بڕوای بە دوارۆژ نییە.

### ٣- هەیوانییەکان (الرواقیة):

ئەم فەلسەفەیە لە سەدەی چوارەمی پێش زایین پەیدا بووە تا پاش زایینیش بەردەوام بوو . ڕەوشت تەوەری فەلسەفەکەیانە کە لەسەر زانستی سروشتی و لۆژیک دامەزراوە. بەلای ئەوانەوە فەلسەفە باخێکە کە زانستی سروشتی خاکە بەپیتەکەیەتی، و لۆژیک پەرژینەکەیەتی، و ڕەوشت بەرهەمەکەیەتی. خواو جیهانی مادییان بەیەک داناوە، هەموو جیهان لای ئەوان بوونەوەرێکی زیندووە و گیانێکی گشتی هەیە و بە یاسایەکی گشتی بەندە. ڕایان وابووە کە جیهان یەکە و شێوەی گۆییە، بەپێی نەخشەیەک یان قەدەرێکی گەردوونی خوایی گشتگیر بە مەبەست و ئامانج هاتۆتەوە یەک، کردەوەکانی کەسان ملکەچی پێویستییە و لێی ڕزگار نابن، ئەوەی هەیە ئایا لەخۆمانەوە لەگەڵیادەڕۆین یان سەپاوە بەسەرماندا. (هەیوانی) تا ڕادەی خۆبەختکردن بەرژەوەندی گشتی پێش بەرژەوەندی تایبەتی خۆی دانابوو، باوەڕیان بە (هاوولاتی جیهان)ەوە هەبووە واتا یۆنانی و نایۆنانی،ئافرەت و پیاو، کۆیلە و ئازاد هەمووی وەک یەکن.

### ٤- خوێندنگەی ئەسکەندەرییە:

پاش دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، خۆرئاوا ڕووبەڕووی شەپۆلێک لە ڕێنمایی ئایینی و سرووتە خۆرهەلاتییەکان بۆوە، بەتایبەتی مەسیحیەت بۆیە فەلسەفەی ئایینی پەیدابوو.

لێرەدا لە خوێندنگەی ئەسکەندەریە لەسەر دەستی ئەفلۆتینی میسری بیردۆزی (ڕژانەوە) هاتەگۆڕێ، ئەفلوتین(لەنێوان ٢٠٣ - ٢٧٠ز

ژیاوە) لە میسر لە دایک بوو،لەگەڵ هەڵمەتێکدا لەدژی فارسەکان سەری لە خۆرهەڵات داوە،لەپاشاندا چۆتە رۆما،یەکێک لەخوێنکارەکانی نووسینەکانی لەبەرگێکدا کۆکردۆتەوە بەناوی(نۆمینەکان- التاسوعات) کە (٥٤) پەیامی بچووکە دابەشکراوە بەسەر(٦) کۆمەڵە،هەر کۆمەڵەیەک لە (٩) نامە پێکهاتووە،بابەتەکانیشی بریتین لە مرۆڤ ورەوشت وجیهانی هەست پێکراو و ئاگاداری خوایی ودەروون و ژیریی وهتد. ئەفلوتین وای بینیوە کە: خوا تەواوە وهەموو بوونەوەرانی تر لەلایەن زاتی ئەوەوە ڕژاونەتەوە بەشێوەی زنجیرە یاخود قۆناغ کە ئەمانەن: ژیری یەکەم، دەروونی گشت، دەروونی تاک، جەستەی زیندووان . تا گەیشتنە کەرەستەی یەکەم کە ئەمە ڕێگەی دابەزینە، هەرچی ڕێگەی چوونە سەرەوەیە، ڕێگەی ڕزگاربوونە لە جیهانی ماددی کە لە جیهانی هەستپێکراوەوە دەست پێدەکات و بەرزدەبێتەوە بەرەو خوا دوای ڕەنجی گیانی.

## فەلسەفە لە شارستانێتی چین دا:

فەلسەفە لەچینی کۆن دا پێش هەزاران ساڵ دەرکەوتووە و کەوتبووە ژێر کاریگەری سێ ئاراستەی سەرەکی بیرکردنەوە (بوزی – تاوی – کۆنفۆشیۆسی) . هەموو ئەو بیروباوەڕە ئاینییانە بە شێوەیەک تێکەڵاوی لەنێوانیان دا هەبوو کە زۆر نزیک بوون لە یەکتری.

ئایینی باو لە چین بریتی بوو لە تێکەڵاو بوونی بابەتە ئەفسوناوییەکان لەگەڵ هەرسێ بیری فەلسەفی ( بوزی، و تاوی، و کۆنفۆشۆسی) فەلسەفەی (کلاسیکی) چینی لە چەرخە کۆنەکان دەست پێدەکات و تا کۆتایی حوکمڕانی بنەماڵەی (تشین -چین)، ئەم ماوەیە بە گرنگترین قۆناغی گەشەکردنی هزری و داهێنان دادەنرێت لە چین.

### کۆنفۆشیۆس:




لەساڵی (٥٥١ پ.ز) لەدایک بووە و لەساڵی (٤٧٩ پ.ز) کۆچی دوایی کردووە . واتە لە سەردەمی بنەماڵەی دووەمی حوکمڕانانی چین ژیاوە و لەخێزانێکی خانەدان بووە و هەر لە منداڵیەوە ئارەزووی بەجێهێنان و بەشداریکردنی بۆنە ئایینیەکانی دەکرد لە پەرستگاکان و لە قۆناغی لاوی دا زۆر ئارەزووی لە زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری دەکرد و هەر زوو شارەزای زۆری لە بواری سیاسەت و زانست پەیداکردووە بۆیە لەناو خەڵکدا، ناوی دەرکرد.

چینییەکان پێش کۆنفۆشیۆس زۆر بایەخیان بە نووسینەوە و تۆمارکردنی

ڕووداو وبابەتەکان نەدەدا (تەنها چەند بۆنە و ئاهەنگێکی ئایینی دیاریکراو نەبێت)، بەڵام کۆنفۆشیۆس ئەم ڕێڕەوەی شکاند و دەستی کرد بەنووسینەوە و تۆمارکردنی ڕووداوەکانی تایبەت بە دەسەڵات و بەڕێوەبردن و بیروباوەڕە کۆمەڵایەتی و داب و نەریتەکان، بەڵام کۆنفۆشیۆس بایەخی بەلێکۆڵینەوەی بابەتەکانی ئەو سروشت (میتافیزیکیا) و گەردوون و مادده و پێکهاتەی مادده و دیاردە سروشتییەکان نەداوە، بەڵکو زیاتر جەختی لەسەر بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ داوە .

نهێنی سەرکەوتن و بڵاوبونەوەی بیر و هزری کۆنفۆشیۆس بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگە و ئەو بابەت و باسانەی پەیوەندی بە ژیانی هاووڵاتی ئاساییەوە هەیە لە (ڕەوشت و هەڵس وکەوتی کۆمەڵایەتی ورامیاری وخۆشەویستی خەڵک ومامەڵەی باش لەگەلیاندا و دەستپاکی و زمان پاکی و ڕێزگرتن لە کەسانی تەمەن گەورە لە کۆمەڵگە و بەپیرۆز ڕاگرتنی خێزان و گوێڕایەڵی ئافرەت بۆ پیاوەکەی، لەهەمان کاتدا دژایەتی ستەم و زۆرداری دەکات و دەڵێت (( دەسەڵات بۆ خزمەتکردنی خەڵکە نەک بەپێچەوانەوە)).

بەپێی بیر و بۆچوونی کۆنفۆشیۆس ڕەفتار و مامەڵەکردنی دەسەڵاتدار لەگەڵ هاووڵاتیان خۆی لەمانە دەبینێتەوە:

أ- ڕێزگرتن لەو کەسانەی کە شایەنی ڕێز و ستایشن.
ب- نزیکبوونەوە و پابەندبوون بە پەیوەندی باش لەگەڵ ئەو کەسانەی پەیوەندی خزمایەتی وکۆمەڵایەتی لەگەڵ کاربەدەستان دەیانبەستێتەوە.
ت- مامەڵەی باش لەگەڵ بەرپرس و کارمەندان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە
پ- بایەخدان بە پەیوەندی گشتی.

**بنەما و بنچینەکانی بیرکردنەوەی کۆنفۆشیۆس:**

١- گوێڕایەڵ بوون بۆ دایک و باوک
٢- گوێڕایەڵی برای بچووک بۆ برای گەورە.
٣- گوێڕایەڵی دەسەڵاتی دادوەری.

٤- دڵسۆزی هاوڕێ بۆ یەکتری.

٥- لەکاتی گفتوگۆ کەسانی دیکە بریندار نەکرێت

٦- قسە و کردار وەک یەک بن.

کۆنفۆشیۆس پێنج کتێبی داناوە کە پوختەی بیروباوەڕی تێدا هاتووە، و کە سودی لە کتێب و سەرچاوە کۆنەکانی پێش خۆی وەرگرتووە:

١- کتێبی شیعر و گۆرانی .

٢- کتێبی مێژوو.

٣- کتێبی گۆڕانکارییەکان.

٤- کتێبی بەهار و پاییز .

٥- کتێبی بۆنە ئایینیەکان.

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

١- بایەخی مێژووی فەلسەفە چییە؟
٢- چی دەربارەی بیردۆزەی لەدایکبوونی گەردوونی بابلیەکان دەزانیت؟
٣- تێڕوانینی دانیشتوانی کۆنی میزۆپۆتامیا و دۆلی نیل لە بارەی بە کێشەی (نەمری) و چارەنووس چییە؟
٤- قۆناغەکانی گەورەکانی مێژوویی فەلسەفە بژمێرە ؟
٥- بیری (میزۆپۆتامیا) و بیری (دۆڵی نیل) کۆن ڕوون بکەوە.
٦- هۆیەکانی پەیدابوونی فەلسەفەی یۆنانی چین؟
٧- بەکورتی خوێندنگە فەلسەفییەکانی یۆنانی پێش سوکرات دیاری بکە.
٨- بۆچی ئیفلاتون بە فەیلەسوفێکی نموونەیی ناودەبرا؟
٩- ڕاستی ناکۆکی نێوان سوفستائی و سۆکرات چییە؟
١٠- لەبەرچی ئەرستۆ بەلوتکەی فەلسەفەی یۆنانی دەژمێردرێت ؟
١١- باسی یەکێ لە فەلسەفەکانی یۆنانی پاش ئەرستۆ بکە و بیانژمێرە، تایبەتمەندییەکانی فەلسەفەی ئەو ماوەیەش دەستنیشان بکە .

## بەشی پێنجەم:

# مێژووی بیری (هزری) فەلسەفەی ئیسلامی
# (خۆرهەڵات و خۆرئاوا)

**خوێندنگەی ئەسکەندەرییە و کاریگەریە هزریەکانی:**

دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی بووەهۆی لێک نزیک کردنەوەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا لەیەکدیەوە لەئەنجامدا بەرهەمی شارستانێتی خۆرهەڵات لەگەڵ شارستانێتی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان یەکی گرت لە قۆناغی (یۆنانی خۆرهەڵات) کەئەوکاتە بە (ئەسکەندەرییە) ناودەبرا و تیایدا (ئایین بە فەلسەفە) و (گیان بە ماددە) ئاوێتەی یەکتربوون بەهۆی تێکەڵاوبوونی کەلەپووری فەلسەفەو ئایین لەگەڵ ئەو فەلسەفەیەی کە بەرەو ناوچەی خۆرهەڵات هاتبوو .

(خوێندنگەی ئەسکەندەرییە) بووە مەڵبەندی بیری فەلسەفە و زانیارییەکان وچەندین کتێبی ناسراو لەبارەی نۆشداری و لۆژیک و گەردوون شتی دیکە تێیدا سەری هەڵدا، سەرباری چەندین لێکۆڵینەوەی تری تایبەت بە زانست و زانیاری وفەلسەفەی هەمەجۆر،خاوەنی ئەم هەموو زانست و زانیاریانەش خەڵکی ناوچەی خۆرهەڵات خۆیان بوون و هەر لەوێش هاتوونەتە دونیاوە ولەوێ گەشەیان بە بیروباوەڕیان داوە . گرنگترین دیاردەکانی فەلسەفە، لەماوەی خوێندنگەی ئەسکەندەرییە خۆی لەبیردۆزی (ڕژانەوە) دەنوێنێ کە ئەفلوتینی میسری (٢٧٠ز مردووە) دایهێناوە لەنێو کتێبی (نۆمینەکان) دایڕشتووە،کە گەردوونی لەسەر بنچینەی (گەردونناسی- ئایینی) شیکردۆتەوە، بەیەکەوە بەستنی هۆکار و پەیوەندی ڕەهای نێوان (هۆکار و ئەنجام) لەو ماوەیەدا لەژێر بیروباوەڕی (لەدایک بوونەکان) هاتۆتە دامەزراندن بەوەی کە لەخوای گەورە دەست پێدەکات و بە ژیری یەکەم و دەروونی گشت تێدەپەڕێ و دوای ئەمانەش دەروونە گەردیلەییەکان ئنجا بوونەوەرە ماددییەکان یەک

بەدوای یەک لە دایکبوون تاوەکو کار لەسەر زەمین بکەن و هەریەکە لەم بوونەوەرانە یەک بەدوای یەک لەخوای گەورە ڕژاونەتەوە هەروەکو چۆن تیشکی خۆر لەخۆرەوە تیشک دەداتەوە و ئاو لە کانیاودا دەرژێتە دەرەوە، بەرێگەیەکی نزیک لە بیرۆکەی بەدوایەکاهاتنی هۆکارەوە، هەروەکو چۆن لەچوارچێوەی (لەدایک بوونەکان) ناسراوە، بەڵام لێرەدا (تاکییە) نەک (جووتی) لەبەرئەوەی لەجیهانی (گەردوون) و لەمێژووی مرۆڤ و ژیاندایە.

## فەلسەفە دوای هاتنی حەزرەتی (مەسیح) سڵاوی خوای لێبێت:

فەلسەفە دوای هاتنی حەزرەتی (مەسیح) سڵاوی خوای لێبێت (ماددەی لەگەڵ گیان) و(سروشت لەگەڵ ئەودیو سروشت) ی یەکخست، و (فەلسەفەی) لەگەڵ (شەریعەت) کرد بەیەک تاوەکو وەڵامدانەوەی گونجاو بەتێڕوانینی تەواوەوە بدات بە دەستەوە، هەروەکو چۆن لە ئیسلامدا هەمان تێڕوانین بەدی دەکرا.

فەلسەفەی کریستیان (مەسیحیەت) لەرێگای ئەفلۆتین و قەشە (ئۆگستین) دوە،وەڵامی فەلسەفەی ڕەوشتیانەی خۆی پێشکەش کرد.

بەڵام دوای رووخانی دەوڵەتی ڕۆمانی لەساڵی (٤٧٨ز) بەهۆی چەند هۆکارێک لە خۆرهەڵات ڕێگەی گۆڕەپانی فەلسەفە بۆ چەند ڕەوتێکی هزری جیاجیا خۆشکرا، ڕۆڵی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی گەردوون و کۆمەڵایەتی لەلایەن دانایانی خۆرهەڵات لەچوارچێوەی ئایینی یەکتاپەرستیەوە کە بەدەرکەوتنی ئیسلام کامڵبوونی بەخۆیەوەدی.

ڕامانی ئەم دانایانە لە گەردوون و ژیان بۆگەڕان بەدوای چارەسەرێکی سەرتاپاگیری ئەوتۆ کە مرۆڤ بەمە نەبێت هەرگیز ڕاناپەڕێ و دەیانویست هاوسەنگی بۆ ژیان و میانڕەوی بۆپەیوەندییەکانی مرۆڤایەتی بگەڕێننەوە دوای ئەوەی کە لاسەنگ ببوون، سەرباری گەڕاندنەوەی پێودانگەکان کە لەناوچووبوون وپێوەرە ڕەوشتیەکان کە بەهۆی لەخۆبایی بوون و توندی ستەم و زۆرداری بیانی تێک چووبوون.

## سێیەم: فەیلەسوفانی موسڵمان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا:

مەبەست لەمانە بەشێوەیەکی گشتی فەیلەسوفانی موسڵمانە کە لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەگشتی و بەغدا بەتایبەتی دەرکەوتن، بەغدا لەوساتانەدا لە ناوەڕاستی چەرخی دووەمی کۆچیدا ببووە مەڵبەندی سەرکردایەتی ڕامیاری جیهانی ئیسلامی وبنکەیەکی شارستانێتی مرۆڤایەتی و شوێنی دیداری نێوان زانایان و فەیلەسوفان و سەرچاوەی زانست و زانیارییەکانی چەرخەکانی داهاتوو. بۆمان هەیە بەهۆی ئەو چالاکیە فەلسەفیەی کەلەم شارەدا دەرکەوت ناوی (خوێندنگەی بەغدای فەلسەفی) لێ بنێین، شان بەشانی (خوێندگەی ئەسکەندەرییە) و ( خوێندنگەی ڕۆما) و (خوێندنگەی ئەسینا) ی فەلسەفی لەوەوپێش چونکە بەغدا کارێکی ئەوتۆی لەگۆڕەپانی فەلسەفەی ئیسلامیدا کردووە و کاریگەریەکەشی لە هیندستان و پاکستان و ئێران و تورکیا درێژدەبێتەوە تاکو دەگاتی خۆرئاوا لە ئەندەلوس، فەیلەسوفانی بەغدا لە پلە و پایەی مامۆستا بۆخوێندکارانی فەلسەفە و زانیاری ئەو وڵاتانە دەژمێردران.

**١- فارابی (ئەبونەسری کوڕی موحەمەد ٣٣٩ ک -٥٩٠ ز مردووە):**

بە مامۆستای دووەم ناودەبرا، چونکە لێکۆڵینەوە لۆژیکییەکانی ڕێکخست و دەستێکی باڵای لە توێژینەوەکانی فەلسەفە و زانیاری و زمانناسی و ڕامیاری هەبووە، لەبواری فەلسەفەی ئیسلامیشدا پێگەکەی لەئاستی پێگەکەی ئەرستۆی (مامۆستای یەکەم) ی فەلسەفەی یۆنانییە . زۆرباش لە فەلسەفەی کندی و خوێندکارەکانی لە بەغدا گەیشتووە جگەلەوەی وەک ئینسکلۆپیدیایەک ناسراوە چونکە زانیاری لەگەڵ فەلسەفە، و ڕامیاری لەگەڵ هونەر و پیشە و مۆسیقا کۆکردۆتەوە، لەبارەی گەردووناسی و مۆسیقا ونۆشداری


فارابی

وبیرکاری و کیمیا نووسینی چاکی هەیە و سەدەها بەرهەمی فەلسەفە و زانیاری پاش خۆی بۆ خوێندکاران بەجێ هێشتووە .

أ- فەلسەفە لای فارابی: خۆی لە زانیاری بونەوەرەکان دەنواند واتە ئەوانەی کە هەن، بەدوای پێکهێنانی وێنەیەکی فەلسەفە سەبارەت بە جیهان (گەردوون) و ژیان لە لەچوارچێوەی سەرتاپاگیری واتە (کۆمەڵایەتی و سروشتی ) و (گەردوونی) دەگەڕا،و بایەخی بە لۆژیک دا شان بەشانی لێکۆڵینەوەکانی لە کتێبە لۆژیکیەکانی ئەرستۆ بە شێوەیەکی ژیرانەی رەخنەگرانە هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە لۆژیکی زمان (منطق اللغة) کاتێ کە (لۆژیکی ژیيری) بە(ڕێزمان)ەوە بەستەوە بە شێوازێکی زانستیانە چونکە لە لۆژیک گشتگیری و لە ڕێزمان تایبەتمەندێتی هەیە.

بەناوبانگترین کتێبەکانی بریتین لە (بیروڕای خەڵکی شارەچاکەکە) (اراء أهل المدينة الفاضلة) و (بەدەستهێنانی بەختەوەری) (تحصيل السعادة) (ئاماری زانستەکان) (احصاء العلوم) ئەمەی دوایی بۆتە سەرچاوەیەکی زانیاری بۆ زانستەکان کە فەیلەسوفانی موسڵمان و بیانی، و موسڵمانان و ناموسڵمانان سوودیان لێ وەرگرتووە.

ب- مایەی شانازیە بۆ فارابی کە یەکێکە لەو فەیلەسوفە دەگمەنانەی کە دەڵێن میزۆپۆتامیای کۆن(کلدانیەکان) سەرچاوەی دانایی (فەلسەفە)ن، لەوێوە بۆ میسرییەکان و یۆنانییەکان گواستراوەتەوە و لەوانیشەوە جارێکی دیکە هەر بۆ موسوڵمانان گەڕاوەتەوە بەمەشیان چالاکییەکانی ژیرایەتی بۆ ڕەچەڵەکی ڕەسەنایەتی شارستانێتی خۆی گەڕاندۆتەوە نەک هەروەکو چۆن هەندێ کەس بەهەڵەدا چوونە و ئەم چالاکییانە بەڕەهایی دەخەنە پاڵ یۆنانییەکان بە تەنهایی

ج- بەڵام لەبارەی (زانیارییە مرۆڤایەتییەکان) و (چالاکییەکانی ژیریی) فارابی وای دەبینی پەیوەندی لە نێوان (وشە) و (بیرۆکە) لەنێو ناخی مرۆڤدا لەلایەک و لەگەڵ (ماناکانیانەوە) بەرامبەر بەجیهانی دەرەکی لەلایەکی دیکەوە هەیە.

فارابی وای بۆ دەچێت کە ئەنجامی هاوتابوونی (تاکی و بیرۆکە) و (کەرستە مادیەکەی) و مانا ورد و قوڵەکەی لەژیاندا (زانیاری ڕاستەقینە) بەردەست دەکەوێت و بەسەر چەند بابەت و ئاستێک دابەش دەکرێن گرنگترینیان:

١- زانیاری هەستەکی تایبەتمەندە بە دیاردەکانی ماددی و بەشەکی لە جیهاندا.

٢- زانیاری ژیریێتی، پەیوەستە بە بابەتەکانی (سەرتاپاگیری) و (گشتگیری) ئەوانەی لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە (سروشت و ئەودیو سروشت)پێک دێنن و بەرزترین پلەکانی زانیارییەکانی مرۆڤایەتین.

### ٢- غەزالی (ئەبوحامد کوڕی موحەمەد ٥٠٥ ک / ١١١١ز):

أ- ئەم فەیلەسوفە بیرمەندە کەبە(لێکدەری بیرکردنەوە)ش دەناسرێ، توێژینەوەکانی لە فیقە (ئاییناسی) و قسەناسیەوە چۆتە سەر (زانستی لۆژیک) و (فەلسەفە) و (سۆفیگەری). لەتوێژینەوەکانیدا پشتی بە بەرنامەکەی کە (بەرنامەی گومان) ی پێی دەوترێت بەست پاش ئەوەی نووسینەکانی لەبارەی (بوژاندنەوەی زانستە ئاینییەکان) و (ئامانجەکانی فەلسەفە) و (پەرۆشبوونی فەیلەسوفان) و (زانستی لۆژیک) دەستپێکرد تا دەگاتە کتێبی (ڕزگارکەری سەرلێشیوان - المنقذ من الضلال).غەزالی هەریەکە لە (ژیریی) و (دەقی شەرعی) کردۆتە ڕێبازێکی گەیشتن بە ڕاستیەکان و هەریەکە لەو ڕێبازانە بوارێکی تایبەتی خۆی هەبووە و نابێت بەڵگەکانی ژیریی لە بابەتەکانی شەرعی(خواوەندی) بەکاربهێنرێت پاش ئەوەی ڕێگەدرا بە ژیریی کە توێژینەوە لە زانستی سروشتی بکات، هەر کاتێکیش


غەزالی

که حوکمێکی ژیریی لەگەڵ هی شەرعدا سەبارەت بە خواوەندییەوە نەگونجابا ئەوا غەزالی شەرعی پێش ژیریی دەخست لەبەر هۆکاری بیروباوەڕی(عەقیدەیی) ئامانجەکەی غەزالی لەگوماندا دەیویست بگاتە یەقین و ڕازی نەدەبوو ڕاستییەکان هەروەکو چۆن هەن لە یەکەم دەرفەتەوە وەربگرێ بەمەشیان بەرنامەکەی غەزالی لەبارەی فیقهەوە لەگەڵ هی سروشتی و خواوەندی جیابوو.

ب- غەزالی ناتەبا بوو لەگەڵ ئەو فەیلەسوفانەی کە شوێن پێی فەیلەسوفانی یۆنانی کەوتبوون سەبارەت بە (کۆنیەتی ماددە) نەک خولقاندنی، یاخود ئەوانەی باوەڕیان سنورداریەتی زانیاری خوداوەندی و(گەڕاندنەوەی گیان - المعاد الروحانی ) لە ڕۆژی دوایی هەبوو (بەبێ زیندووبونەوەی جەستە - لا البعث الجسدی)، بابەتەکانی خواوەندی کە لە کتێبەکەیدا (پەرۆشی فەیلەسوفان - تهافت الفلاسفة) باسی کردووە ناچێتە ژێرباری (ژیریی مرۆڤی کەم درک بە نهێنیەکانی جیهانی غەیب)، بەڵکو ئەمەیان تایبەتمەندە بە (ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر د.خ) .بۆ نمونە بڕوابوون وتەسلیم بوون بە پیرۆزیەتی ڕاستی خواوەندی لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز وەردەگرێت

ت- پاش ئەوەی غەزالی لە بەغدا ناودار و ناسراو بووە.

پ- لەدوا ساتەکانی ژیانیدا ڕووی کردۆتە دەروێشی (سۆفیگەریەتی) و بەغدای بۆ حەجکردن بەجێ هێشتووە و بۆ ماوەی دە ساڵ لە شامدا ماوەتەوە و لەدوایشدا ڕووی کردۆتە زێدی بابوباپیرانی خۆی لەشاری (گوس) لە خوراسانی ئێران، دوای ئەوەی دەستی هەڵگرت لەو هێرشانەی کە کردبوویە سەر فەلسەفە و فەیلەسوفان لەهەندێ لەکتێبەکانیدا چونکە کاریگەری خراپی لەسەر فەلسەفە بەجێ هێشت بەتایبەتی لەسەر خەڵکانی نەزان و ناڕۆشنبیر.ساڵی (٥٠٥ ک) کۆچی دوایی کرد.

## دووەم: فەیلەسوفانی خۆرئاوای ئیسلامی:

بیروباوەڕ لە (ژووررووی ئەفەریقا و ئەندەلوس) لەو گەشەسەندنەی شارستانێتی خۆرهەڵات دانەبڕابوو(لە فەلسەفە وزانست و قسەناسی)، ئەمەشیان دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی پیشەی (نووسین و پەڕ وکاغەز) و بازرگانێتی کردن بەکتێب، بەرهەمەکانی فەیلەسوفانی خۆرهەڵات دەگەیشتنە بەردەستی خوێندکارانی خۆرئاوا ئەوانەی بەدوای زانست و زانیاریدا عەودالْ بوون وخوازیاری ئەوەبوون سەردانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بکەن بۆئەوەی شوێن و بنکە ئایینیەکان و قوتابخانە زانستیەکان ببینن، بەکورتی فێربوون لە زانایان و دانایانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی ئاواتی فەیلەسوفانی خۆرئاوا بووە.

دیارترین ڕواڵەتەکانی پێشکەوتنی شارستانیەت لە ئەندەلوس لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی حەکەمی دووەم (کە ساڵی ٣٦٦ک/ ٩٧١ز مردووە) سەری هەڵداوە چونکە لەو سەردەمەدا کتێبی فەلسەفە و زانستی لە خۆرهەڵاتەوە بۆ ئەندەلوس هێناوە تا وای لێهات خوێندنگەکانی ئەندەلوس بوونە بنکەی ڕاکێشانی خوێندکارانی بیانی و ئەوروپی بۆئەوەی لەسەر دەستی فەیلەسوفانی موسڵمان لەم وڵاتەدا فێربن بەتایبەتی لەشاری قورتوبە .گەر بێتوو دەیەها لە فەیلەسوفانی خۆرئاوا بخەینە لایەکەوە ئەوا دەبێ لەبەردەمی (ئیبن روشد) تا دەگەینە (ئیبن خەلدون) بووەستین، چونکە ئەمانە شوێنەواری چالاکییەکانی فەلسەفەیان لەو چوارچێوەیەدا بەرچاو و بەردەستە.

### ١- ئیبن روشد (ئەبو ئەلوەلید کوڕی ئەحمەد ٥٩٥ ک/١١٩٨ ز ):


ئیبن روشد

گەورەی قازییەکانی ئەندەلوسە و لەناودارترین پزیشکەکانی قورتوبە بووە بەناوبانگترین فەیلەسووفە لە فەیلەسوفەکانی خۆرئاوای ئیسلامی وئەندەلوس، هەندێ کەس (بە لوتکەی خوێندنگەی خۆرئاوا وئەندەلووس) ناویان بردووە شانبەشانی پلەوپایەی فارابی لە خوێندنگەی خۆرهەڵات لە

بەغدا ئەمەش بەهۆی بەرهەمەکانی وبەرنامەکەی وخوێندکارەکانی و ئەو کاریگەریانەی کە جێی هێشت.

### أ- کاریگەریەکەی:

لەپاڵ توێژینەوە پوختەکانی بۆ کتێبەکانی ئەرستۆ چەندین بەرهەمی لەبارەی (بەرنامە) و (زانیاری)یەوە هەبووە، لەمبارەیەوە خۆی بۆ بەرگریکردن لە (فەلسەفەو فەیلەسوفان) و (بیرکردنەوەی فەلسەفەی زانستیانەی سەربەست) تەرخان کردبوو .ئیبن ڕوشد فەلسەفە ژیرییەکەی بەپێی پوختەی کتێبەکانی ئەرستۆ تۆمارکردبوو هەروەکو چۆن فەیلەسوفانی خۆرهەلاتیش لەبارەی شیکردنەوە ڕەخنە و ڕوونکردنەوە مامەڵەیان لەگەڵ (کتێبەکانی ئەرستۆ) کردبوو. ئیبن ڕوشد سەبارەت بە ئایین و فەلسەفە و دۆزینەوەی بەرنامەی بەڵگەکان وجیاکردنەوەی ڕاپۆرتی جیاکردنەوەی پەند و شەریعەت نووسیویەتی وەک بەرپەرچ دانەوەیەک بەرامبەر بە کتێبەکەی (پەرۆشی فەیلەسوفان) ی غەزالی. سەبارەت بە کتێبە فەلسەفیەکانی خۆی ڕاستی بیروڕای دەربڕیوە و نوسینەکانی لەبارەی پوختەی کتێبەکانی ئەرستۆ و کتێبی (کۆمار)ی ئەفلاتون بووە.

### ب- بەرنامەکەی:

ئیبن روشد بەرنامەکەی لەسەر بنەمای داننان بە سەربەستی ژیری و إجتهاد لە بوارەکانی بیرو زانست داناوە و، (إجتهاد) لە فیقە لەنێو موسڵمانان و فەقیهەکانیش ڕێپێدراوە، لەم بارەیەوە (ئیبن روشد) دەیگوت (گەرهاتوو فەقیە ئیجتهادەکەی ڕاست و ڕەوان بوو ئەوا دووچاکەی بۆ هەیە و گەر هەڵەشی کرد ئەوا چاکەیەکی هەیە) لێرەدا ئیبن ڕوشد بەڕووی نەیارانی فەلسەفە دەوەستێ و دەڵێ (ژیرەکان لە داناییدا باشترن گەر هەڵەش بکەن) ئەمەشیان داننانێکی شەرعە بەرۆڵی فەیلەسووفان لە گەڕانیاندا بەدوای چارەسەرکردنی ئەو جۆرە کێشانەی کە وەلامی ڕوون و ڕەوانیان بۆ نییە، بەم پێوانەیەشەوە دەبێ ژیرەکان پاداشت بکرێن سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی توێژینەوەکانی فەلسەفەی ئیسلامی،

هەروەها پشتی بەهەمان بنچینەی مامەڵەکردنی لەگەڵ بەرهەمەکانی فەلسەفە بەستووە و دەڵێت (دەبێت پاداشت بۆ زیرەک بێت هەرچەندە هەڵەش بکات) تا گۆڕەپانەکەی فەلسەفە و فەیلەسوفانی لە تۆمەتەکانی دژیان بێگەرد بکات.

**ت- ئامانجەکەی:**

بەرنامەکەی ئیبن ڕوشد لەسەر (ژیری و سەربەستی و زانینی زانست و إجتهاد) داڕێژراوە دەیویست پەیوەندی نێوان (فەلسەفە) و (ئایین) پتەو بکاتەوە پاش ئەوەی ئەم جۆرە پەیوەندییە دووچاری خراپە ببوو لەخۆرهەڵاتی ئیسلامیدا.

**هـ- فەلسەفەکەی:**

ئیبن ڕوشد وای دەبینی کە دەبێ فەیلەسوف بەبەستنەوەی شتەکان هۆکاری پێویستی هەبێ کە ئەنجامەکان بۆ هۆکارەکان ڕابکێشێ و درک پێکردن بەم پەیوەندییە و لایەنەکانی دەرفەت بۆ ژیر و هۆشمەند برەخسێنێ تا(زانیاری ڕاست) بناسێ، کاتێک ئەم وتەیەشی دەوت وەک بەرپەرچدانەوەیەک بۆ غەزالی کاتێ دانی بەبوونی هۆکارە (السببية) نەدەنا،و ئەشعەریەکان کە (غەزالی) نوێنەریان بوو ئەوانیش دانیان بەبوونی (هۆکاری سروشتی) نێوان شتەکان نەدەناو لەیادیان نەبووە کە ئەمەیان بنچینەی (زانست و زانینی زانست ویەقینە) . هەربۆیەش ئیبن ڕوشد بەرگری لە فەیلەسوفانی دەکرد و تۆمەتەکانی غەزالی دژ بە فەیلەسوفان ڕەت دەکردەوە بەتایبەتی لەبارەی زانیارییەکانی خواو کۆنیەتی جیهان و گەڕاندنەوەی گیان، دەیگوت: خوا لەوە گەورەترە کە زانیارییەکانی بەشێوەیەکی بەشەکی وەیان بەتێکڕای وەسف بکات و ئەوەی دەسەلماند کە زانیاری خوا وەک زانیاری ئێمە نیە تا پێوانە بکرێت بەمەش تۆمەتەکانی غەزالی هیچ مانایەکی بۆ نییە هەروەها (زانیاری خواوەندی) یشی بەشێوەیەکی گشتگیری وسەرتاپاگیری لێک دەدایەوە بەوەی کە هەمووان لە زانیارییەکانی دیکە دەچنە ژێر ڕکێفیەوەو

سەبارەت بە کۆنیەتی مادده و پەیدابونیان وای بۆ دەچوو کە ئەمەشیان تەنها (إجتهاد)ە و هیچ لەتواناداری خواوەندیەتی کەم ناکاتەوە، چونکە موسوڵمانان لەوە حاڵین کە خوا دروستی کردون و ڕێکیخستوون و جوڵەی داونەتێ .

ئیبن ڕوشد وای دەبینی کە (زیندوبوونەوە) لەدوارۆژدا (گیان و لەش) دەگرێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی وا لەشێوەی ژیانی ئێستاکەی مرۆڤی سەر دنیا ناچێت بەڵکو ئەم زیندووبونەوەیە بەستراوەتەوە لەلایەکەوە بە چۆنێتی ڕاستی کاری مرۆڤ و ڕەفتاری سەر دونیایی، لە لایەکی دیکەشەوە بە ناوەڕۆکی ژیانی دووەم و مەرجە میتافیزیکیەکان هەروەکو چۆن خوای گەورە تایبەتمەندی دەداتێ .

هەرچەندە فەیلەسوفان دەربارەی توێژینەوەکانی سەبارەت بە (سروشتی) وەیان (خواوەند) لەیەک جودان کەچی هەمووی لە بازنەی إجتهادی ژیری دەرناچێت و خاوەنیشی ناخاتە نێو بازنەی شەرمەزاری و بیرکردنەوە، بەم شێوەیە ئیبن ڕوشد ڕێگەی ڕاپەڕاندنی بیر و بەرنامەی لە دەوڵەتانی ژووررووی ئەوروپا سازکردووە، پاش ئەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەهۆی چەند هۆیەکی رامیاریەوە دوای ڕووخانی بەغدا و لەدوایش کەوتنی غەرناتە پاشەکشێی کردبوو لە شارستانێتی دابڕا و دواکەوت.

## ئیبن خەلدون(٨٠٨ ک / ١٢٠٦ ز )


ئیبن خەلدون

وەلیەدینی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی موحەمەدی تونسی

ئیبن خەلدون جیهانی وا هاتۆتە بەرچاو کە گەورەترە لەوەی (هۆشی مرۆڤ) بۆی بچێت، ئیبن خەلدون وای بۆچووە کە ماقوڵ نییە مرۆڤ لە هەموو شتێکی نێو گەردوون بگات تەنها بە لۆژیک و تاقیکردنەوە دوور لە (شەرع)! بە واتایەکی دیکە کۆی زانیارییە

پێگەیشتووەکانی لە (لۆژیکی ژییری)و(تاقیکردنەوەوسروش) دەبنە بناغەی سەرەکی زانیاریەکانمان سەبارەت بەم بوون(الوجود)ە ئالۆزە.
أ- فەلسەفەکەی: فەلسەفەکەی خۆی لە ناوەرۆکی کتێبە ناسراوەکەیدا (پێشەکییەکەی ئیبن خەلدون- مقدمە ابن خلدون) پوختەکردووە لەبارەی نەهامەتی ڕووخان (محنة السقوط) و هۆیەکانی ڕاپەڕین (أسباب النهضة) لە بواری (کۆمەڵناسی) و (ئاوەدانکردنەوە و فەلسەفەی مێژوو)، باسی کورتەیەکی مێژووی فەلسەفە و لۆژیکی بۆ خوێندکاران کردووە لە میانەیەوە هەست بە پاشماوە خراپەکانی قۆناغی پاشەکشێی رامیاری هزری دەکرێت کە لە ئەنجامدا بۆتەهۆی ڕووخانی بەغدا ساڵی (١٢٥٨ز) فەلسەفەی ئیبین خەلدون ڕووی کردۆتە خوێندنی (تاقیکردنەوەی مرۆڤایەتی) ئەویش لە چوارچێوەی عەرەبی ئیسلامی تاوەکو ئەنجام بگاتە ئەوەی کە(یاسا) ڕووداوەکان شی دەکاتەوە وەک ئەنجامێک کەلە هۆیەکانی جیانابێتەوە، بە واتای ئەوەی کە ڕووداوە مێژووییەکان وکۆمەڵایەتیەکان ئەنجامن و بەهۆیەکانی دوورو نزیک و ئاشکراو شاراوە دەبەسترێنەوە.
مرۆڤی ژیر (دانا) دەتوانێ لە تۆڕەکەی پەیوەندی شاراوەی دوا شتەکان بگات و ئەنجامە چەوتەکانی دووبارە نەکاتەوە ئەمەشیان (فەلسەفەی مێژووە). ئیبن خەلدون لە توێژینەوەیەکی تایبەت بە هۆیەکان دەڵێت (هەموو شتێک هۆی سروشتی هەیە و زنجیرەی هۆیەکان دەگاتە یەکەم هۆکار کە (خوای گەورەیە)
ب- مایەی شانازییە بۆ ئیبن خەلدون کە بەر لە زانایانی خۆرئاوا توێژینەوەی کردووە لەبواری کۆمەڵناسی و فەلسەفەی نوێ وەک شارستانێتی و مێژوو) و کارتێکردنی ئاشکرای لەسەر ئەوروپا هەبووە، بۆیە بەسەرەتای سەرهەڵدانی مێژووی نوێی نەتەوەی عەرەبی دەژمێردرێت.
پ- ئیبن خەلدون بەشداری لەسازکردنی بیردۆزی گەشەسەندن کردووە و سوودی لە بیروڕا ی فەیلەسوفە موسڵمانەکانی پێش خۆی وەرگرتووە.
بیروباوەرەکانی (ئیبن خەلدون) سەبارەت بە رامیاری و دەوڵەت و

شارستانیەت و کۆمەڵگە لەسەر بیرۆکەی (خولانەوەی زیندوو) دامەزراوە بۆ شتەکان و دامودەزگاکان و تاکەکەسان کەبە لەدایکبوون و لاویەتیەوە دەست پێدەکات و بە کەوتن (پیریەتی) تێپدەپەڕێ و بە (مردن) کۆتایی پێدێت، ئەم خولانەوەیە و گۆڕانکاریانەی جیانەکردۆتەوە لە بابەتەکانی وەک (سروشتی دەسەڵاتدار) و (ئابووری) و(زانست) و (زانیاری)، هەروەها یاسای هێز و یەکگرتنی کۆمەڵگە و پێشکەوتنە شارستانێتیەکەی لەسەر توندڕەوی بنیاد ناوە(واتە توندیی یەکگرتنی کۆمەڵگە) ئابووریەکی پتەویش کەلەسەر بەرهەمهێنانی ژیان وهۆکارەکانی دامەزرابێ بنەماو بناغەی پێشکەوتن و خۆشگوزەرانییە چونکە زێدەی بەرهەم(واتە سەررێژی) لە خزمەتی پێشکەوتنی زانست وشارستانیەت دەخرێتەگەڕ بەپێچەوانەی کۆمەڵگەی بەکاربەر کە دەبێتە پاشکۆی بێگانە و بەلاوازی دەمێنێتەوە و هەموو کاتێک چاوەڕێی قەیرانی لێ دەکرێت.

کاتێ ئیبن خەلدون ئازاری لە دواکەوتن و ناکۆکی و ناتەبایی نێوان عەرەبەکان دەچەشت خەڵکی لەوە ئاگادار کردەوە کە عەرەبەکان نەتەوەیەکی خاوەن شارستانێتی ڕەسەن و ڕەگ و ڕیشە قووڵن هەرکاتێ بارودۆخێکی گونجاویان بۆهەڵکەوێ دەتوانن سەر لەنوێ دەرفەت بقۆزنەوە و دواکەوتوویی و لەت لەت بوون وەلا بنێن و هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێن.

ئیبن خەلدون سەبارەت بەستەم و زۆرداری و پاشکۆیاتی بێگانە و نەفامی و ناکۆکی و ناتەبایی کەلەو سەردەمەدا باوبووە تابلێی زوێرو بێزار بووە و ئەو چەرخەشی بەچەرخی (إعرابی) ناساندووە نەک (عەرەبی)! چونکە ئەوان لە ناوەرۆکی ئایین و ڕەوشتە چاکەکانی عەرەب و ئاینی ئیسلام نەگەیشتبوون. بەم پێیە ئیبن خەلدون بۆتە یەکێ لە ناودارانی عەرەب وموسلمانان بەتایبەتی و جیهان بەگشتی و توانیویەتی یاسای خولانەوەی کۆمەڵگە و فەلسەفەی ژیان دابنێت و لەپاش خۆشی کەس لەناوچەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا پەرەی بە فەلسەفەکەی نەداوە، دوابەدوای ئەو (فەلسەفە)و(کۆمەڵگە) هەنگاوی بەرەو دواوە ناوە و باری (چوونەناویەک)ی بەخۆیەوەدیوە.

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

١- زانایانی قسەناسی چ لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری فەلسەفە هەبووە؟
٢- جیاوازی نێوان قسەناسی و فەلسەفەی فەیلەسوفانی ئیسلام چییە؟
٣- هۆی دامەزراندنی فەلسەفەی ئیسلامی چییە؟
٤- فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی ئیسلام چ کەسانێ بوونە؟ لەسەر دووانیشیان بدوێ.
پ٥- مەبەست لە فەیلەسوفانی ئیسلامی خۆرئاوا چییە؟ دەوری ئیبن خەلدونیش لە فەلسەفەی مێژوودا چییە؟

# بەشی شەشەم

## هزری نوێی ئەوروپی لەسەردەمی بوژانەوەی ئەوروپاو هەندێ لە ئاکارە فەلسەفییە نوێیەکان

**یەکەم: هزری ئەورووپی لە چاخی نوێدا:**

ئەگەر سەرنجی مێژووی فەلسەفەی کریستیان (مەسیحیەت) لەچاخەکانی ناوەڕاست و چاخی بوژانەوە(ڕێنسانس) و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو بوژانەوەیە (٤٠٠ تاوەکو ١٦٠٠ز) بدەین، دەبینین چۆن فەلسەفەی یۆنانی گەشەی سەندو چۆن فەیلەسوفانی کۆنی یۆنانی بناغەی فەلسەفەیان دامەزراند و پرس و لێکۆڵینەوەیان سەبارەت بەبابەتە سەرەکییەکانی فەلسەفە وەک جیهان و مرۆڤ و زانیاری و بیروباوەڕ و هەروەها بەهاکانی ڕەوشت و جوانی خستەڕوو، هەروەها پێشنیاری چەندین چارەسەری جیاجیان بۆ کێشەکان دانا.

لە کۆتایی چەرخی یۆنانی و ڕۆمانی کۆندا، ئایینی کریستیان (مەسیحیەت) لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا بڵاوبۆوە لێرە بەدواوە مێژووناسانی خۆرئاوا ئەم سەردەمەیان بە (چاخەکانی ناوەڕاست) ناوناوە کە لە سەدەی پێنجەمەوە تا چواردەهەمی زایینی درێژی هەبووە و بەسەر دوو ماوەدا دابەش دەبێت:

یەکێکیان سەردەمی زوو (پێشوەخت) ئەوی تریان سەردەمی دواتر(درەنگ) کەلە نێوانیاندا شارستانێتی ئیسلامی هەیەو لەڕێگەی ئەوەوە بوو کەشارستانێتی یۆنانی بۆ خۆرئاوای لاتینی گواسترایەوە. سەرباری ئەوەی فەیلەسووف و بیرمەندان لە هەموو بوارەکان داهێنانیان کرد، کەچی وەک لەمەوبەر روونمان کردەوە کە چاخەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپادا لایەنی ئایینی باڵی بەسەردا کێشابوو وهەندێ شێوازی نوێ لە ژیانی بیری(هزری)و کۆمەڵایەتی و ئابووری کە کڵێسە تەوەری سەرەکی دەنواند،پەیدابببوون.فەلسەفەش لەم ڕێچکەیە بەدەر نەبوو.

چەند هۆکارێکی ناوخۆیی یەکلاکەرەوە هەبوون کەپەیوەندیان بە دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئەوروپییەوە هەبوو، وەک دۆزینەوە جوگرافیەکان و، هەڵمەتی خاچ دروشمەکان و، گەشانەوەی بازرگانی لەگەڵ خۆرهەڵاتدا و سەرهەڵدانی شارو دانیشتوانە بۆرجوازەکانی و کەڵەکەبوونی سەرمایە و، بەربەرەکانی نێوان میرو پاشاکان لە لایەکەوە و لە نێوان دەرەبەگ و کڵێسە لەلایەکی ترەوە، سەرباری کۆچی زانایان بۆ ئیتاڵیا لە دوای دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز و دەستبەسەرداگرتنی (قوستەنتینیە) لەلایەن عوسمانیەکان ساڵی ١٤٥٣ز دا،و بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی لەلایەن مەزهەبی (پرۆتستانت) دژی مەزهەبی (دەست هەڵگرتنی ژیان)ی کڵێسەی کاسۆلیک.

هۆی کاریگەری تریش هەبوون، لەو بوارانە، وەک داهێنانی (چاپ و باروت وقیبلەنما) ئەم سێ داهێنانەی دوایی دەورێکی گەورەتریان لە دروستکردنی مێژوودا بووە زیاتر لە دەوری ڕامیاری یان داگیرکردنەکان و ناکۆکی ئایینی، هەروەک (فرەنسیس بەیکۆن) وتویەتی .

بێجگە لەوانە بزووتنەوە ویژەییەکەش کە (بوژانەوە) یان (ڕێنسانس) ی پێوتراوە، واتا بوژانەوەی ویژە و فەلسەفەی کلاسیکی( کۆن)، کە بە ئاشکرا ژیانخواز بوون و لەپاڵ ڕەخنەی بیریی(هزریی)دا ڕۆڵیان لە لێکۆڵینەوەش دا هەبووە، (ناوییەکان) بە بڵاوکردنەوەی ڕەخنەو گومان،و فرەنسیکان ڕەبەنی دێرەکان بەهۆی تاقیکردنەوە زانستیەکان،بەسەرسوڕمانەوە بۆیان دەرکەوتبوو کە چۆن شتەکانی ڕەوشت جۆرە مەزنێتی و چێژیان هەیە .ئەوان و چەندانی دیکە ڕۆڵیان لەپەیدابوونی بیرکردنەوەی زانستی نوێ هەبووە.

بەم شێوەیە تۆوی ڕۆشنبیریەکی بیری(هزری) نوێ دەستی پێکرد و زمانە نەتەوایەتیەکان پەرەیان سەندوپوختربوون وبوونە زمانی ویژەیی (ستاندارد)،هونەری چاپکردنیش فراوان بوو بۆبڵاوکردنەوەی زانیاری کە ئەمە لەگەڵ گیانی بازرگانی، بیرەکانی کەسێتی نەتەوایەتیان هێنایە کایەوە، بە نەهێشتنی ئەو لەمپەرانەی کە گوندە لاچەپەکانی لەیەک دابڕاندبوو کە

لە ڕووی ئابوورییەوە بە پێی ڕامیاری (خۆبژێوی)دەژیان. بەرنامەیەکی زانستی نوێ دەستی پێکردو ڕێی خۆی کردەوە تا وای لێهات نەدەتوانرا لەبوارەکانی زانست و ناسینی سروشت بە دەسەڵاتی کڵێسە ڕازی بن،بۆیە داوای لێکۆڵینەوەلە شتەکانی سروشت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەکرا نەک تەنیا وەک ئەوەی لە کتێبەکاندا هەیە، بەڵکو لەسەر بنچینەی تێبینی بۆ سروشت و دیاردەکانی،و لەسەر بنەمای ژیریی توێژەرەوە وەستا. وای لێهاتبوو لەهەموو ئەو وڵاتانەی کە سیستەمی سەرمایەداری نوێ تیایاندا چەکەرەی کرد،پێشکەوتنی ڕیشەیی بنەڕەتی لە زانستە سروشتییەکان و جوگرافیا و مێژوو و کومەڵناسی و هونەری و، بیرە ڕامیارییەکان دەبینرا، ئەم دەربڕینانەی دەربارەی هۆشیاری مرۆڤایەتی هەبوون هەموویان لەژێرکاریگەری پەرەسەندنی پیشەسازی وبازرگانی وکۆمەڵایەتی گۆڕانیان بەسەرهات.

دیارترین تایبەتمەندیەکانی ئەو سەردەمە نوێیە دووبارە ناسینەوەی تاک و بە ئاگاهێنانەوەی تاک بوو کە لە نێو کۆمەڵی بوون و گشتی بوونی کڵێسە و دەرەبەگایەتی ون ببوو. ئەو ئەرکەی لە زانست و فەلسەفە و هونەر و وێژە دەویسترا، بوو بە ئەرکی ناسینی جیهان و سوودوەرگرتن لە هەموو شتێک بۆ پتردەوڵەمەندکردنی ژیان.

**خەسڵەت و دەرئەنجامەکانی ئەم پێشکەوتنانە لەسەر زانستی نوێ و فەلسەفەی نوێ:**

ئەنجامەکانی ئەو پێشکەوتنانە بەسەر زانستی نوێ و فەلسەفەی نوێ بوونە هۆی گۆڕینی چەمکی (ناوەندیی ئایینی) دەرهەق بەزانست و فەلسەفە بۆ چەمکێکی نوێ کە بە (فەلسەفەی نوێ یان بە چاخی نوێ) ناوی دەبرا کە ماوەکەی لەنێوان سەدەی حەڤدەهەم تا سەدەی نۆزدەهەم دەگرێتەوە وسەرەتاکانی بۆ چەرخی ( بوژانەوە) دەگەڕێتەوە.

دەتوانرێت ڕوانینە نوێیەکە بۆ زانست و فەلسەفە لەم خاڵانەدا کورتبکەینەوە:

١- بایەخ بەڕووداو و زانست دەدات، وبەڵگەکانیشی لەسەر گریمانەی ئەوتۆ دامەزراوە کە دەتوانرێت بە تێبینی و تاقیکردنەوە ساغ بکرێتەوە، بە پێچەوانەی فەلسەفەی چاخەکانی ناوەراست کە پشتی بە بەڵگەهێنانەوەی لۆژیک و پێوانەکاری دەبەست، وئاوڕی لە تاقیکردنەوەو تێبینی و تێڕوانین، نەدەدایەوە.

٢-هەوڵی شیکارکردنی کێشەکان دەدات بە گەڕانەوە بۆ (ڕووداوی نموونە)نەک بۆ ڕامان، بە پێچەوانەی چاخەکانی ناوەراست.

٣- بایەخ بە جیاوازی چەمک و فێڵی لۆژیک نادات، هەروەک چاخەکانی ناوەراست کە بەبێ هیچ بیانوێک وایان دەکرد.

٤- تاڕاددەی نوقمبوون بایەخ بە ڕابردوو نادات، چونکە رانەبردووی زۆری لە پێشە تا بیان دۆزێتەوە، بەم شێوەیە لە پابەندبوونە ئایینی و بیرییەکان(هزریەکان) دەربازی بوو کە کڵێسە بەسەر فەلسەفە و زانست و بیر لە چەرخی تاریکیدا سەپاندبووی.

٥- ڕووی کردە (ئەم جیهانە) و دەوڵەمەندکردنی، کەچی فەلسەفەی چاخەکانی ناوەراست ئەمەی پشتگوێ خستبوو لە پێناو جیهانی پاش مردن بێ ئەوەی ڕوانینە نوێیەکە جیهانی پاش مردن لە بیربکات، و بایەخی بە مرۆڤ داو دانی نا بە تواناکانی هۆش (ژیریی)و تاقیکردنەوەکانی مرۆڤ بۆ ناسینی جیهان ودۆزینەوەی ڕاستیەکان.

٦- باوەڕهێنان بەوەی جیهان و مرۆڤ چاکن، ئەمەش ڕوانینێکی نوێیە بە پێچەوانەی ڕوانینەکەی چاخەکانی ناوەڕاست کە بەشی زۆری باوەڕی بەخراپەی سروشتی مرۆڤ بووەو بەو خراپیەی کە تێیدایە و لێی ڕزگار نابێت لە ژیانی سەر زەوی ئەمە لە ئاراستەکانی (ئۆگستین) ئاشکرایە.

٧- بەکارهێنانی بەرنامەیەکی نوێ لە زانستە سروشتیەکان و لێکۆڵینەوەی ئەو دیاردانەی کە لە سەر یاسا دەرهێنانی زانستی لەلایەن (فرەنسیس بەیکۆن) ەوە دامەزراوە، هەروەها ڕاوێژپێکردنی ژیریی و ملکەچ پێکردنی هەموو شتێک لە لێکۆڵینەوەی ژیریی لەلایەن ((دیکارت))ەوە

کە بەرنامەی تاقیکاری (بەیکۆن)ی پێ تەواو کردو توخمی ژیریی لە زانستدا پشتگوێ خستبوو، ئەو توخمەی کە سیتسەم و یاساکانی پشت دیاردەکان دەردەخات.

بەم شێوەیە بە هەردووکیان مژدەی فەلسەفەی رۆشنکەرەوەی گەشبینیان دانا سەبارەت بە تێگەیشتنی سروشت و ملکەچ پێکردنی لێکۆڵینەوە بۆ بەکارهێنانی لە پێناوی پێشکەوتنی ژیان و دەوڵەمەندکردنی مرۆڤ . وای لێهات هەموو جیهانی ماددی و ژیریی ملکەچی تێبینی و تاقیکردنەوە بوون، ڕوو لە لێکۆڵینەوەی بنەچەی زانینی شتەکان کرا.

مرۆڤ دەستی کردە پرسیاری ئەوەی: بنچینەی زانیاری و درک پێکردن چییە؟ سەرچاوەیان چین، ژیرییە یان تاقیکاریە؟

لێرەدا بیردۆزی (تاقیکاریەکان) سەری هەڵدا کە دەڵێت: زانیاری لە تاقیکاریەوە سەرچاوەی گرتووە، و ئەم بیردۆزە لە ئینگلتەرا لەسەر دەستی (بەیکۆن و جۆن لۆک و دیڤید هیۆم) دەرکەوت.

بیردۆزی (ژیرییەکان) لە وڵاتە ئەوروپیەکانی دیکە کە ڕابەرەکەی (دیکارت) ە لە پاش ئەویش (لایبنتز و سپینۆزا)،سەری هەڵدا و دەڵێت بنچینەی زانیاری ژیرییە.

ژیرییەکان و تاقیکاریەکان لە نەژادی زانیاریەکانیان دەکۆڵیەوە و هەردووکیان باوەڕیان بە ژیری مرۆڤ و تواناکەی هەبوو بۆ زانینی شتەکان، هیچیان توخنی بابەتی (شیانی زانینی شتەکان) نەدەکەوتن، و ئایا ژیریی توانای پەیداکردنی زانیاری هەیە و سنووری زانینمان چییە؟ تا (کانت) ی ئەڵمانی هات و لێکۆڵینەوەی بۆ شیانی زانیاری ئاراستەکرد، وخودی ژیریی مرۆڤی خستە بەرباس ولێکۆڵینەوە لە ڕێباوەرەکەی کەناوی (فەلسەفەی ڕەخنەکاری) لێنراوە.

### یەکەم: ڕێباوەری ژیریی (هۆشیاری):

ڕێباوەری ژیریی یاخود هۆشیاری وای بۆ دەچێ کە هۆش هەر خۆی بە بێ تاقیکردنەوەلە ڕاستی جیهان تێدەگات، تواناداری هۆشی مرۆڤ

(بەر لە تاقیکردنەوە) هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی ڕاستی و زانیارییەکان تا دەگاتە چەند ڕاستیەکی نوێ.

ئەم ڕێباوەرە لەو بڕوایەدایە کە هەندێ پرەنسیپ لە هۆشدا خۆرسکن بەر لە تاقیکردنەوە هەن و لەو سەربەخۆن و زۆر پێویست و یەقینن هەروەک پرەنسیپی (گشت لەبەش گەورەترە)، ئەم ڕێباوەرە پشت بە زانیاری بیرکاری دەبەستێ وەک نمونەیەک هەوڵی بەدیهێنانی دەداتلە فەلسەفەدا. ڕێباوەری ژیرێتی وای دەبینێ کە ژیریی هەر خۆی بە تەنیا بەسە بۆ هەموو زانیارییەکان و زانیاری تاقیکاری لێ دوور دەخاتەوە، (دیکارت)یش نوێنەرێکی ئەم ڕێباوەرەیە.

**دیکارت (١٥٩٦–١٦٥٠ز ژیاوە):**



فەیلوسوف و زانایەکی فەڕەنسیە، زۆر گرنگی بە زانستەکانی سەردەمی خۆی دابوو بەتایبەتی بیرکاری بایەخیشی بە فیزیا و فەلسەفە وزانستەکانی دیکە داوە.

(دیکارت) وای بۆ دەچوو کە یەک زانست هەیە ئەویش فەلسەفەیەو چەند لقێکی جیای لێ بۆتەوە، لەو بڕوایەشدا بووە کە یەک زانیاری هەیە، ئەویش زانیاری ژیریی یەقینی ڕاست و ڕەوانە و، دەیوت یەک بەرنامەی زانیاری هەیەو لەمەوە دەتوانین سیستەمێکی تەواوی زانیاریەکان بنیادبنێین کە بتوانێ نەشونما بکات.

(دیکارت) بە گومانکردن لە بەرنامەوە دەست پێدەکات کەهەموو زانیاریەکان بەلاوە دەنێ،نە ژیریی نە هەستەکان ناگەنە یەقین، چونکە جار هەیە هەستەکان دەمانخەڵەتێنن و ژیریی لە دەرەنجامەکان هەڵە دەکات. ئێمە چۆن بزانین هەمووی بەو شێوەیە نییە، کەواتە ێویستە لە گومانەوە دەست پێ بکەین نەک لە پێناو گومان، بەڵکو وەک شێوازێک لە ڕەخنە گرتن لەو زانیارییەی کە هەیە و گەڕان بۆ زانیارییەکی یەقین ئەم گومانەی بە (گومانی بەرنامەیی) ناونرا، گومان لێرەدا شێوازێکە

بۆ تاقیکردنەوەی زانیاری و هێزە ژیرییەکانمان، بەرنامەیە بۆ گەیشتنە یەقین.

(دیکارت) وای تێبینی کردبوو کە هەرچەند بازنەی گومانەکان فراوانتربێت، ئەوە دەمێنێتەوە کە گومان پێی نەگات وەک:

أ- تەنێکی بازنەیی رووبەرێکی تەخت سنوری دەدات.

ب- دوو هێڵی ڕاست ناشێت شوێنێک گەمارۆ بدەن.

پ- گشت لە بەش گەورەترە.

جـ- گەر من گومان بکەم لە بوونی هەموو شتێک کە هەیە، بەڵام شتێک دەمێنێتەوە کە جێی گومان بێت ئەویش خودی (گومان) ەکەی خۆمە، کەواتە لەوێدا شتێک هەیە بەکرداری گومان هەڵدەستێت، لەوەدا شتێک هەیە کە بیردەکاتەوە کەواتە (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم) .

دیکارت هێڵە گشتیەکانی بەرنامەی ڕاستی لە دانراوەکەی بەناوی (ڕاپۆرتێک لەبەرنامەکە) دەخاتەڕوو ئەم بەرنامەش بەپێی ئەم چەند بنەمایەن:

١- بنەمای گومان ٢- بنەمای شیکرنەوە ٣- بنەمای بەیەکتربەستنەوە ٤- پێداچوونەوە و ئامار

## دووەم: ڕێباوەری تاقیکاری:

ئەم ڕێباوەرە پشت بە تاقیکردنەوە دەبەستێت و تاقیکردنەوەی هەستەکی بە بنچینەی زانیارییەکان دادەنێت و ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چۆن تاقیکردنەوە دەمانگەیەنێتە زانیاری و چۆن بەرنامە پەیڕەو دەکەین سەرباری خەملاندنی سەختییەکانی سەر ڕێگەمان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان. ئەم ڕێباوەرە ئەوە دەسەلمێنێ کە هەمو زانیاریەکانمان لە تاقیکردنەوە دەرئەنجام دەبێت لێیەوە دەستی پێدەکرێت، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە تاقیکردنەوە سەرچاوەی زانستە هەر بیروباوەڕێک و زانیارییەک بە تاقیکردنەوە تێنەپەڕیبێ، ئەوا دەبێ بیگەڕێنینەوە بەر تاقیکردنەوە ئەگینا ڕەواییەکی بۆ نییە.

تاقیکارییەکان باوەڕ بە هیچ زانیارییەکی خۆرسک و شاکاری بەر لە تاقیکردنەوە ناکەن بەمەش هاودژن لەگەڵ ڕێباوەرانی ژیریێتی، فەیلەسوفانی ئەم ڕێباوەرە تێبینی و دەرئەنجام دەکەنە بەرنامەی خۆیان و فیزیای نیوتن بە نموونەیەکی چاکی فەلسەفەکایان دەزانن.لێرەدا لە ڕۆڵی فرەنسیس بەیکۆن وەک نوێنەری ئەم ڕێباوەرە دەدوێین.

**فرەنسیس بەیکۆن (١٥٦١–١٦٢٦ز ):**

یەکەم فەیلەسوفی نوێیە کە ئەرکی دامەزراندنی بەرنامەیەکی زانستی نوێی گرتە ئەستۆی خۆی، ناوی نووسراوەکەی (ئامرازە نوێیەکە) کە واتای ئەوە دەبەخشێت، دژ بە تێگەیشتنە کۆنەکەی زانست وەستا کە پشتی بە (ئۆرگانۆن) ی ئەرستۆ بەستبوو.

پێش کەمێک باسی ئەوەمان کرد کە هەریەک لە (بەیکۆن و دیکارت) وا لە زانست گەیشتبوون کە سەپاندنی زاڵیی مرۆڤە بەسەر سروشتدا بۆ دەوڵەمەندکردنی ژیانی مرۆڤ، بەڵام ئەمە بە زانینی هۆیە ڕاستییەکانی پشت دیاردە سروشتەییەکانەوە نەبێت نایەتە دی، بەڵام لە کرداری زانیاریدا هەڵە ڕوودەدەن لە ئەنجامی پشت بەستن بە بۆچوونی ژیریی لە ئەنجام دەرهێنان و دەرخستنی ڕاستی وەک تاکە هۆیەکی زانیاری، واتا پشتبەستنی ئەرستۆ و (خوێندنگەکەیان) بە پێوانەکاری کە لە حوکم دان سەرچاوە دەگرێت و ئەمیش بە دەوری خۆی لە چەمکەکان پێکهاتووە، چەمکەکانیش لە ڕێی گشتاندنی پەلەلێکراوەوە پێکدێن، لەبەر ئەمە مەرجی یەکەمی چاکسازی زانست و پێشکەوتنی زانیاری مرۆڤایەتی، بریتیە لەچاککردنی ڕێبازەکانی گشتاندن و بژارکردنی چەمکەکان لەبەر ئەوەی کرداری گشتاندن کردارێکی ئیستقرائی (هەڵێنجان) ە، بنچینەی لۆژیکیانە بۆ چاکسازی زانست دانانی بیردۆزێکی نوێ بوو بۆ ئیستقرائی (هەڵێنجان)، فەیلەسوفەکانی پێش (بەیکۆن) بایەخی خۆیان لە ئیستقرائی (هەڵێنجان) دا ئاراستەی ئەو ڕووداوانە دەکرد کە لەگەڵ گشتاندن دەگونجان یان نەدەگونجان .

(بەیکۆن) ئەوانەی بە (سەرچاوە سلبیەکان ) ناوبردوون و بەشێوەیەکن کە ڕووداوێک یان گشت یان بەلای کەمییەوە بەشێکی گشتاندنە پەلەپێکراوەکان پووچەڵ دەکاتەوە .بەیکۆن ڕای وایە گوێ نەدان بەسەرچاوە سلبیەکان هۆی سەرەکی هەموو حوکم دان و بەهەڵەچوونەکانە.

هەرچی مەرجی دووەمی چاکسازی زانستە بریتیە لە پاککردنەوەی ژیریی لە بەهەڵەچوون .

(بەیکۆن) چوار جۆرە بەهەڵەچوون یان تەگەرە جیادەکاتەوە کە دێنە ڕێی زانیاری ڕاست و بە (بتەکانی ژیری) ناویان دەبات کە ئەمانەن:

١- خەیاڵی (اوهام) هۆز
٢- خەیاڵی (اوهام) ئەشکەوت
٣- خەیاڵی (اوهام) بازاڕ
٤- خەیاڵی (اوهام) شانۆ

دوای ئەم هەریەک لە فەیلەسوفەکانی وەک جۆن لوک ودیڤید هیۆم ئەم ڕێچکەیان گرت.

## سێیەم: ڕێباوەری ڕەخنەگری:

ئەم ڕێباوەرە دەرەنجامی ئەو پێشکەوتنەیە کەلە فەلسەفەی هەردوو ڕێبازی (ژیرێتی) و (تاقیکاریی) هاتنەدی بە سوود وەرگرتن لە دەستکەوتەکانی هەردووکیان، ئەم هەڵمەتەش فەیلەسوف (عەمانۆئیل کانت) پێی هەڵساوە بۆ کۆکردنەوەی هەردوو ڕێباوەر لەیەکتریدا و ئنجا زانیاریەکانی خۆشی خستە سەر و گەیشتە ئەوەی کە ژیریی و تاقیکردنەوە بۆ کامڵبوونی زانیاری پێویستن و وای بۆ دەچوو کە تاقیکرنەوە بێ ژیرایەتی کوێرایەتیەکی بێ ئاکارە هەروەها ژیرایەتی بێ تاقیکرنەوەش پوچ و بێ ناوەرۆکە. فەلسەفەکەی (کانت) بە ڕەخنەگری ناونرا، چونکە ڕەخنەی لە تواناکانی زانیاری مرۆڤایەتی دەگرت بەوەی کە سنوردارە.

(کانت) دەڵێت ژیریی بە سنووردارییەکەی حوکمی لەسەردەدرێ لەبەر دەم بابەتەکانی میتافیزیکی گەورە کە پەیوەندیان بە خواو جیهان و دەروونەوە هەیە هەڵوێستێکی بەرامبەربوونی نواندووە.

## دووەم: فەلسەفەی خۆرئاوای هاوچەرخ:

**١- گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە کاریان کردە سەر پێکهاتنی ژیانی هزری(بیری) لەسەدەی (١٩-٢٠)، ئەمانەبوون:**

أ- شۆڕشی فەرەنسا وشەڕەکانی ناپلیۆن لە سەدەی (١٨-١٩) و دەرەنجامەکانی لەڕووی بیری و رامیاری و کۆمەڵایەتی.

ب- شۆڕشی پیشەسازی لە ناوەراستی سەدەی (١٨) تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و دەرەنجامەکانی لەڕووی ئابووری کۆمەڵایەتی و ڕەوشتیەوە و ئەنجامە خراپەکانی بەسەر کۆمەڵگە و چەوسانەوەی کرێکاران و خواردنی ڕەنجیان لە دەوڵەتانی پیشەسازیدا .سەرباری سەرهەڵدانی بزووتنەوە ئیستعمارییەکان لە دەوڵەتانی سەرمایەداری بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی کەرستەی خاوی هەرزان وبازاڕی تێدا دەدۆزنەوە بۆ ساغ کردنەوەی شمەکەکانیان. ئەو بیردۆزەی فەرەنساییەکان هێنایانەکایەوە کە دەڵێت: (ڕێگە بدە با کاربکات) و (ڕێگە بدە با تێپەڕێ) دوابەدوای ئەوەش ئابووریناس (ئادەم سمیپ) ئەم بیردۆزەی دووبارە کردەوە،و ئاراستەی وڵاتە ئیستعمارییەکانی لەسەر دەڕۆیشت.

پ- پێشکەوتنی خێرا ویەک بەدوای یەکی زۆربەی زانیارییەکان لە بیرکاری و فیزیا و کیمیا و زیندەزانی و دەروونناسی...هتد.

ج- ناجێگیربوونی نەخشەی رامیاری ئەورووپا وجیهان تا سەرەتاکانی بیستەم و لەپاش هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی و چەند جار دارشتنەوەی ئەو نەخشەیە .

د- دەرەنجامە خراپەکانی بیریی و دەروونی هەردوو جەنگەکە بەسەر خەڵکیدا و ناکۆکی ئایدۆلۆژی نێوان هەردوو بلۆکی(جەمسەری) خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

## ٢- ڕەوتەکانی بیریی و فەلسەفی لەسەدەی نۆزدەهەم:

فەلسەفەکەی عەمانۆئیل کانت (١٧٢٤- ١٨٠٤ز ١ژیاوە) بە خاڵێکی گۆڕانکاری لە مێژووی فەلسەفە دەژمێردرێت هەروەک ئەو خاڵە گۆڕانکاریە دادەنرێت کە(ئەفلاتوون و ئەرستۆ) بەسەر مێژووی فەلسەفەی یۆنانی هەیانبوو، گرنگترین ئەنجامەکانی فەلسەفەی (کانت) سەرهەڵدانی شەپۆلێک بوو بە ناوی (نموونەیی) کەلەگەڵ(هیگل) دەستی پێکردو وای بۆ دەچوو کە ژیریی مرۆڤ دەتوانێ لە ڕاستی بگات و دای بڕێژێت و هەرگیز سنووردارنییە، هیگل پێی وایە ڕاستی لە جوڵە دایە و دەتوانێ لە کۆکردنەوەی بیرۆکەیەک و هاودژەکەی بیرێکی نوێ پێک بهێنرێ، ئەمەشی بە (ڕاڕا) ناساند، هیگل بە نمونەیی دادەنرێت چونکە ئەولەویەتی بە گیان داوە، ساتەکانی گیانی بە سێ بەش لێک داوەتەوە: هونەر و ئایین و فەلسەفە، لوتکەی ڕاستەقینەی ڕەهان فەلسەفەشی بەسەر هەموو لایەنەکانی ڕاستی تەنانەت مێژووش داسەپاند. لە ژێر کاریگەری فەلسەفەکەی (عەمانۆیل) و (هیگل) و فەیلەسوفانی دیکەی ئەڵمانی بزوتنەوەیەکی دیکەی ڕۆمانسی لە وێژە و هونەر پەیدا بوو

ڕێباوەری نموونەیی بەرەو ئینگلتەرا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا کشاو دووچاری (ڕاڕایی ماددی) بۆوە کە ڕاڕایی هیگلی بەکارهێنا و ماددەو یاساکانی لەپێش گیان دانا بەوەی هەموو شتێک پابەندە بەماددە و یاساکانی، تەنانەت کۆمەڵ و مێژوو و وێژەش هەروان. (مارکس) کەبە یەکێک لەدانەرانی ڕاڕایی ماددی دادەنرێت پێی وایە شیکردنەوەی ماددیانە بۆ کۆمەڵگە واتە زاڵبوونی لایەنی ئابووری بەسەر هەموو لایەنەکانی دیکەدا،وهەوڵی دا مێژوو شی بکاتەوە بۆ ناکۆکی چینایەتی نێو کۆمەڵگە، و فەلسەفەکەی تاکاتێکی دوور و درێژ کاریگەری هەبوو وهەندێ لە دەوڵەتان پەیڕەویان دەکرد.

لە هەمان هەگبەدا ڕەوتی سۆشیالیستی لە فەڕەنسا و ئینگلتەرا و ئەڵمانیا پەیدابوو فەیلەسوفانیان خەریکی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەلایەتیەکانی ئەوروپاو خۆرئاوا بوون لەو قۆناغەدا ئەمان تێڕوانینێکی

گشتیان دەربارەی ڕاستی و کۆمەڵگە خستەڕوو و ڕۆڵی مرۆڤ و زانا و فەیلەسوفانیان بۆ چاککردنی بارودۆخی کۆمەڵگە دەستنیشان کرد.

سۆشیالیستەکان هەوڵیاندا کە تێڕوانینەکانیان بە کردار جێبەجێ بکەن لەمیانی کۆمەڵگەکان و گوندو دێهاتەکان و بەشداریان لەدروست کردن و ڕێکخستنیان کرد.

لە فەرەنسادا ڕەوتێکی دیکە سەری هەڵدا، بەناوی: دانراو (الوضعي) فەیلەسوفی فەرەنسی (ئۆگست کۆنت) دەستی پێکردکە هەوڵی دا بەرنامەی زانستی دانراو جێبەجێ بکات لەسەر بیر و کۆمەڵگە.مەبەستیش لە زانستی دانراو ئەو زانیاریانەیە کەپشت بەو واقیعە دەبەستێت کەلە ڕاستیەکان و تێبینیەکان هەڵقوڵاوە بۆ زانینی ئەو یاسایانەی کە ئەو واقیعانە دەدۆزنەوەلە ڕێگای تاقیکردنەوە.

(کۆنت) پێی وایە ئەو فەلسەفە دانراوەی هەماهەنگی دەکات لەنێوان زانستەکان ئەوا تاکە فریاد ڕەسی مرۆڤ و کۆمەڵگەیە،(کۆنت) لە بواری کۆمەڵناسی ناوبانگی دەرکردووەو بەگرنگترین ئەو زانستانەی داناوە بۆ دانانی ئەو یاسایە جێگیرانەی کە بەهۆیەوە کۆمەڵگە گۆڕان وگەشەی بەسەردادێ.

لەگرنگترین ئەو بیر(هزر)انەی کەلەسەدەی (١٩) سەریانهەڵدا بریتی بوو لە (بیردۆزی گەشەسەندن) ی زانا چارلز داروین کەلەسەر ئەم سێ بیر(هزر)ە دامەزراوە:

أ- بیرۆکەی ململانێ لە پێناو مانەوە (الصراع من اجل البقاء) کەلەبەر دەگمەنی دەرامەت و زۆری پێداویستیەکان، بونەوەران دەکەونە ململانێ تاوەکو (مانەوە) بۆ خۆیان و ڕەگەزی خۆیان دابین بکەن.

ب- بیرۆکەی هەڵبژاردنی سروشت (الانتخاب الطبيعي) بەوەی ئەوەی بە توانا و بەهێزە دەتوانێ لە سروشتدا بمێنێتەوە وە ئەوەی لاوازە لەناو دەچێ.

پ- بیرۆکەی مانەوە بۆ چاکترینیان ( البقاء للاصلح) بەهۆی ململانێ لەگەڵ سروشت و بوونەوەرانی دیکە تەنها ئەو بونەوەرانە دەمێننەوە

که خۆراگرن و پێش دەکەون بۆئەوەی بەرگەی مانەوە بگرن .
(داروین) بڕوای وایە شێوەی ئێستاکەی بوونەوەران ئەنجامی چەند گۆڕینێکی شێوەیەتی پاش ململانێ لەگەڵ سروشت و دەوروبەریدا .
هەندێ لە فەیلەسوفان و بیرمەندان چەمکی گەشەسەندنیان بەسەر مێژوو و کۆمەڵ و مرۆڤدا سەپاند، هەندێکیان وایان دادەنا کە هێزو ململانێ گەوهەری ڕاستی دەردەخەن، کەچی لەلایەن هەندێک لە فەیلەسوفان و پیاوانی ئایینی و فەیلەسوفانی ڕەوشتی ڕەخنەیەکی توند دژ بە چەمکی گەشەسەندن و ئەنجامە فەلسەفییەکەی و ڕەوشتیەکەی ئاراستەکراوە.
جا پێویستە لەسەرمان پێش ئەوەی کۆتایی بێنین بەخستنەڕووی ئەم بیروهزرانەی کاریگەریان هەبوو لە سەدەی نۆزدەهەم، دەبێت ئاماژە بۆ ئەو لێکۆلینەوانە بکەین کەلە دەروونی مرۆڤایەتی دەکۆڵنەوە کە کاریگەری گەورە هەبووە و پزیشکەکان و دەروونناسان پێوەی هەڵساون وەک سیجموند فرۆید و کارل یونغ و کەسانی دیکە لە هەوڵدانی تێگەیشتنی دەروونی ئادەمیزادی و دەرخستنی ڕەفتاری ئادەمیزادی، ئەم لێکۆلینەوانەش کاری کردەسەر چەند لایەنێکی بیرو فەلسەفە و وێژە. جا بەو شێوەیە شیکردنەوەی دەروونی بوو بە بابەتێکی ترو دەخرێتە پاڵ بابەتەکانی دی بۆ تێگەیشتنی ڕاستی مرۆڤایەتی.

### ٣- فەلسەفەی هاوچەرخی سەدەی بیستەم:

لە بواری زانستدا لە سەدەی بیستەم ئەو پێشکەوتنە تەواوە هاتەدی کەزانایان لە کۆتایی سەدەی (١٩) دەستیان پێکردبوو لە بارەی بیرکاری و کیمیا و فیزیا و زانست وزمانناسی و دەروونناسی و کۆمەڵناسی و ڕەخنەگری و وێژەیی،کەوا کاریگەری گەورەیان لەسەر فەلسەفە جێ هێشت بەتایبەتی لەبارەی لۆژیک وبیردۆزی زانیاری و میتافیزیکیا و فەلسەفەی زانیاری و فەلسەفەی جوانی.
هەروەها هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەبوو بەسەر میتافیزیکیا و ڕەوشت، بۆیەش لەو

سەردەمەدا گرنگی بەسروشتی مرۆڤ و ڕاستی (بوون)ی مرۆڤ پەیوەندی بەگەردوون ولێپرسراویەتی بەرامبەر بەخۆی و کۆمەڵەکەی درابوو. چەند ڕەوتێک هاتنە ئاراوە وەک (بوونەکی) کە دەیوست مانای بوونی مرۆڤ و ئەرکی سەرشانی دەرهەق بەڕەوشت دەست نیشان بکات.

لە خۆرهەڵاتیش پاش کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم و روخانی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر ئەم بەشە و شارستانێتیەکەی ئەوا ئاسۆی شارستانێتی دەیڕوانیە پاشەڕۆژێکی پرشنگدار وەک بەشێک لە بونیادنانی شارستانێتی مرۆڤایەتی کە تەمەنی بۆ هەزاران ساڵ لەمەبەر دەگەڕایەوە .

هەندێ لە هەڵمەتەکانی خۆرهەڵات مەبەست لێیانەوە گەیشتن بوو بە خۆرئاوا ناسینی ئەو شارستانێتیەبوو لەلایەکی دیکەوە بایەخی بە ناسنامە و کەلەپووری ناوچەکە دەدا.

بەڵام لە خۆرئاوادا فەلسەفە بەهەموو لقەکانیەوە گەشەی سەند و لۆژیک پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی لەسەردەستی (جوتلوب فریجە و برتراند رسل) وچەند خوێندنگەیەکی لۆژیکی تاقیکاری هاتنەکایەوە، لەبارەی زانیارییەکانی سروشتەوە ئانشتاین و چەند زانایەکی دیکەی فیزیا چەند بیردۆزێکی نوێیان داهێنا وەک بیردۆزی ڕێژەیی و تێڕوانینێکی نوێیان بۆ گەردوون هەبوو جیا لەو تێڕوانینەی پێشوو کە لەسەردەمی نیوتن باوبوو.

شیکردنەوە گرنگییەکی زۆری پەیداکرد لەسەدەی بیستەم کە مەبەست لەشیکردنەوە کرداری دابەشکردنی ڕاستییەکان یان دەستەواژە فەلسەفیەکانە بۆ پێکهاتە سەرەکیەکان و دەستنیشانکردنی واتا و سروشت وئەرکی هەریەکەیان، لەوانەیە ئەم شیکردنەوەیە زمانەوانی یاخود لۆژیکی یاخود فەلسەفی بێت. فەیلەسوفان وایان دەبینی کە شیکردنەوە بەرنامەی گرنگی فەلسەفەیە وزۆربەی زۆری کێشەکانی فەلسەفە دەتوانرێ چارەسەربکرێ لەڕێی دەست نیشانکردنی واتا و بابەتەکانی و، پەردە

لەسەر لایەنە چەوتەکان و شاراوەکانی وتەکانی فەلسەفە هەڵبدرێتەوە.
بابەتی شیکردنەوە گەورە فەیلەسوفانی وەک (براتراند رسل) و چەندینی دیکە پەیڕەویان کرد.
لێکۆڵینەوە زمانەوانیەکان چەندین لقی لێ بۆوە،ئەوەبوو زانستێکی فراوان و گشتکیر بەناوی زانستی ئاماژە (سیمیوتیقا) دروست بوو کەلە هەموو هەڵسوکەوتێک وجوڵەیەکی مرۆڤ لەکاتی مامەڵەکردنیدا لەگەڵ خەڵکی دەکۆڵێتەوە لەڕێی قسەو پەیوەندیکردن،گرنگترین ئەو ئاماژانەش بریتین لە زمان کە سیستەمێکی تایبەت بە خۆی هەیە لەگەڵ چەندین زمانی دیکەی ئاماژە وەک زمانی هێماونیشانەکانی هاتوچۆ و زمانی مۆسیقا و زمانی زانست و هی دیکە.
لەو لێکۆڵینەوانەی دیکەی بواری زمانەوانی کە پەیوەندی بە بە زانستی ئاماژەوە هەیەو لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردوو دەرکەوت ناوی (پەیکەربەندی) بوو کە واتای شێوەی چەند دیاردەو بابەتێکی جۆراوجۆر دەگرێتەوەو شتە جۆراوجۆرەکان بەشدار تێدادەکەن،بۆنمونە (پەیکەربەندی زمانەوانی) ئەو شێوە گشتیەیە کەلە زمانە جۆراوجۆرەکان دەیبینین کە وای لێدەکات وێکچوو بن لەڕووی پەیکەربەنیەوە هەرچەندە وەک زمان جیاوازیش بن.
(پەیکەربەندی کۆمەڵایەتی) ئەوشێوەیەیە کەلە کۆمەڵگەیەکدا هەیەو لەکۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی دیکەدا دووبارە دەبێتەوە.
(پەیکەربەندی) گرنگییەکی زۆری پێدرا لە لە وێژەو رەخنەی وێژەییدا، لەو فەلسەفانەی کەلە سەرەتادا کەوتنە ژێر کاریگەری زانستەوە(خوێندنگەی پراگماتی) بوو کە هەوڵی دا پێوەرێک بۆ ڕاستییەکان دابنێ پشت بە وەرگێڕانی زانستیانە ببەستێ بۆ چەمکە زانستی و فەلسەفیەکان، پێی وایە کە ڕاستیەکانی هەر بیرۆکەیەک پێوانە دەکرێ لەڕێی دابەشکردنیەوە بۆئەو هەنگاوە زانستیەی کە دەکرێ بە وەرگێڕانی هەڵسین.
کەواتە هەرچەند چەمکە ڕووتەکان بۆ چەند هەنگاوێکی کرداریی وەربگێڕین ئەوا زیاتر قبوڵ دەکرێت، ئەگینا بە پێچەوانەوە خۆمان لە

بەردەم بیرۆکەیەکی شاراوە وبێ ماناو بێ نرخ دەبینینەوە،هەندێ لەم پراگماتیانە ویستیان ئەم بیروباوەڕانە لە بواری پەروەردە و فەلسەفەی زانست بەکار بهێنن، ئەوەبوو ئەم تێڕوانینە گۆڕانکاری بەسەر هات تا ئەو ڕادەیەی کە لە بەرژەوەندی خۆیەتی زیاتر ڕەچاوی نەدەکرد، کەچی هەندێ لە فەیلەسوفانی دیکە دەیانگوت بەو بیرۆکەیە گیانی سەرمایەداریی بەرجەستە دەکا.

لێرەدا دیاردەیەکی تر بەناوی بەناوی (واقیعیەت) وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر بەدیاردەیەکی (نموونەیی) پەیدابوولە ژێرکاریگەری فەلسەفەکەی هیگل. ئەم دیاردەیە بوونی سەربەخۆیی جیهانی دەرەکی دەسەلمێنێت و دەڵێت بیر و هۆش و خۆیەتی پلەی یەکەمیان نەبووە لە بوون یان زانیاری بۆیە هەرشتێک بیانویستایە لێیتێبگەن ئەوا بە بەپێی واقیع دوور لە شیکردنەوەکانی نموونەیی و گیانی لێکیان دەدایەوە.زۆر لە فەیلەسووفان ئەم فەلسەفیان بەفەلسەفەی (واقیعیەت) ناوبردووە. هەندێ لە فەیلەسوفانیش بە توندی ڕەخنەیان سەبارەت بەتایبەتمەندی و تەخانکردن لە شیکرنەوەی فەلسەفیدا دەگرت و دەیانگوت دەبێ فەیلەسووف لە میانەی دیاردەی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی مامەڵە لەگەڵ هزردا بکات و نابێ پشت بە شێوەیەکانی ڕووت ببەستێتەوە بەڵکو دەبێ کێشەکەی لە میانی ئەو ئەرکە جۆراوجۆرانەی کە مرۆڤ لە نێو کۆمەڵگەکەیدا دەیکات وەیان لە چالاکییەکانی سەبارەت بە زانست و ئاین و سیاسەت و فەلسەفە چارەسەربکات، ئەمانەش هەموویان بەیەکتری بەستراونەتەوە.

هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی دیکە بە ناوی ئەنترۆپۆلۆجی (علم الانسان) سەری هەڵدا، ئەم فەلسەفەیە لە بوونی مرۆڤ لە نێو کۆمەڵگەو ئەو چالاکیانەی ئەنجامی دەدات لێک دەداتەوە.

دیسانەکە لە سەدەی بیستەم فەلسەفەی بوون (الوجود) و فەلسەفەی دیاردەیی پەیدابوون.

له کۆتاییدا ئاماژه به گرنگترین گۆڕانکارییەکانی مێژووی فەلسەفە دەکەین له سەدەی بیستەم بەتایبەتی لەدوای شەستەکاندا که ئەویش خۆی له(فەلسەفەی ژینگە) دەبینێتەوە پەیڕەوکەر و لایەنگرانی ئەم فەلسەفەیە دەنگیان هەڵبڕی لەدژی پیسکردنی ژینگە لەلایەن خۆرئاواییەکان بەوەی تەکنەلۆژیای نوێ بەچاکی بەکارناهێنن و زەرەرو زیان له خۆیان و زیندەوەرانی دەوروبەریان دەدەن و سروشت تێک دەدەن، فەیلەسوفانی ژینگە تێڕوانینەکانی فەلسەفەی خۆرئاوا به تێکدانی ژینگە تاوانبار دەکەن و مرۆڤی خۆرئاوایی له ریزی پێشەوە دادەنێن بەوەی که بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەخەنە سەرووی شتەکانەوە.

دەتوانین بڵێین فەلسەفە له سەدەی بیستەمدا زیاتر پەرەی سەند چونکه مامەڵە لەگەڵ لایەنە نوێ و ئاستەنگەکانی سەر رێی مرۆڤی سەدەی بیستەم بکات لەوکاتەی پێی ناوەتە نێو سەدەی بیست و یەکەم .

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

١- بیری فەلسەفەی ئەوروپی نوێ چۆن پەیدابوو، هۆکاری پەیدابونیشیان چین؟

٢- دەربارەی (دیکارت) و (بەیکۆن) چی دەزانیت؟ تەنها باسی یەکێکیان بکە.

٣- گرنگترین تەزووەکانی فەلسەفەی نوێ چین؟ بیانژمێرە لەسەر یەکێکیان بدوێ.

٤- مەبەست لە: - أ- ڕێباوەری ژییری ب- ڕێباوەری تاقیکاری (ئەزموونگەری) ج- فەلسەفەی ڕەخنەگری چییە؟ یەکێکیان هەڵبژێرەو بەکورتی باسی بکە.

٥- دۆزینەوەی ئاشکراکردنە زانستیەکان چ کارێکی کردە سەر فەلسەفە و ئاکارەکانی.

٦- جیاوازی نێوان فەلسەفەی نموونەیی و فەلسەفەیی ماددی مێژوویی چییە؟

٧- گرنگترین ڕەوتەکانی فەلسەفەی ئەوروپی لەسەدەی بیستەمدا چییە؟

٨- سروشتی بیری خۆرهەلات لەسەردەمی بوژانەوەی رۆژگاری ئەمرۆمان چییە؟

## پێرست